2

# باپیرە نوور

## فێرمان دەکات



محمد پاکسو



ناوی کتێب: باپیرە نوور فێرمان دەکات

بەرگی دووەم

نووسەر: محمد پاکسو

وەرگێڕ: دۆستی عوسمان

پێداچوونەوە : بەفراو جەمال

چاپ: یەکەم-٢٠١٤

# ئەو زاتە هەموو شتێکی پێ بەخشیوین



گەر خواردنە خۆش و میوە بەلەزەتەکانمان وەك بەخشش و
چاکەی خوای پەروەردگار لا خۆش و چێژدار بێت، ئەوا
بەم شێوەیە خۆشەویستیی و سوپاسگوزاریی مەعنەویی
خۆمان بۆ ناوە پیرۆزەکانی (الرحمن) و (الرحیم)ی خوای
گەورە دەربڕیوە، لەبەرئەوە هەمیشە بڵێ:
(چەند جوان بەدیهێنراوە!) نەك: (چەند جوانە!).

لەڕێی گەڕانەوەتدا بەرەو ماڵەوە، زۆر برسیت، گیانت دەلەرزێت، بیر و خەیاڵت هەر لای خواردنە، هیچی دیکەت بە خەیاڵدا نایەت، چونکە گەدەت هاواری لێ هەستاوە، پێش ئەوەی بگەیتەوە ماڵەوە ئەمە بەخەیاڵتدا دێت: سفرەیەکی ڕازاوە، کە حەزت لە چی بێت

لەسەری بێت، قاپێك پەتاتە وەك دەنووکی کەو سوورکرابێتەوە، پەرداخێك ماستاوی سارد و کەلەتەزێن، شۆربایەکی گەرمی بەلەزەت، لە تەنیشتیەوە لیمۆیەکی ترش و ئاودار قاش کرابێت، دواتریش پاقلاوەیەکی پڕ لە فستق!

هێشتا تەواو نەبووە، لە پاش نان خواردنیش دڵت بۆ میوەی تازە و جۆراوجۆر لێ دەدات، پرتەقاڵی ئاودار و سێوی سوور و قۆخی گەورە و قەیسی زەردی ئاڵتون ئاسا... ئیتر ئەمە خەیاڵی برسێتیی هەموومانە. زۆریشم نەوتووە، نەتانبیستووە کە دەڵێن: (هێندەم برسییە، دەتوانم فیلێك بخۆم!).

کاتێك گەیشتیتەماڵەوە، بۆنێکی خۆش مەستی کردیت، تەماشا دەکەیت خەیاڵەکانت بوون بە ڕاستی و، دایکت ئەو سفرە و خوانەی بۆ ئامادەکردوویت کە بە خەیاڵتدا هاتووە.. لەوکاتەدا دەتوانیت خۆت ڕابگریت؟ یەك چرکە ڕابوەستیت؟

نەوەڵا! بێ سێ و دوو ناوی خوای لێدێنیت و قۆڵی بۆ هەڵ دەماڵیت و، چیت بەرچاو کەوت یەك یەك و دوو دوو پارووی لێ دەکەیت و ڕەوانەی گەدەتی دەکەیت...

برسیەتییت ڕەوییەوە و، سوپاس بۆ خوا تێربوویت.

بەڕاستی ئەمە ڕووداوێکی زۆر جوان و شاهانەیە!

ئێمە هەموو ڕۆژێك چەند جارێك ئەم كرداری نانخواردنـە دووبـارە دەكەینــەوە، بــە ویســت و ئــارەزووی خۆمــان، بــێ مانــدوبوون و بێزاربوون، تەنانەت یەك ڕۆژیش فەرامۆش ناكەین.

پەروەردگاری میهرەبان، چەندە مەزنیت! بۆ ئـەوەی خۆتمـان لا خۆشەویست بكەیت، چیت بۆ بەدیهێناوین!

ســەرەتا گەدەیــەكی پــڕ ئــارەزوو، هەســتێكی وەك برســێتی، خەیاڵێك كە تامەزرۆی خواردنمـان دەكـات، زمانێـك كـە بەهۆیـەوە بـۆ هەر خواردنێك تامێكی جیاواز و لەزەتێكی خـۆش هەست پێدەكـەین، ئەمــە جگــە لــە هەســتێكی وەك تێرخــواردن.. لەســەروو هــەموو ئەمانەشەوە، دایە گیان. جا هەر جۆرێك لـەو میـوە بـەتام و خۆشـانە وەرز و كـاتی دیـاریكراوی پێگەیشـتن و، شـێوەی دارەكـەی و گـەڵا و گوڵـەكانی تایبەتمەنـدیی خۆیـان هەیـە، بـۆنی هەریەكـەیان تایبـەت و جیاوازە، هەر میوەیەكیش تاموچێژی تایبەتی خۆی هەیە.

ڕاستە ئەمانە هەریەكـەیان جۆرێكـە و لەیـەكتری جیـاوازن، بـەڵام خۆ هەموویان بەرهەمی یەك كارگەن.

بەشـێوەیەكی گشـتی خـۆڵ و گڵەكـەیان یەكـە و، سەرچـاوەی ڕووناكییەكـەیان -كـە خـۆرە- یەكـە و، هــەوا و بایەكـەیان یەكـە، ئاوەكەشیان یەكە...



له هەمووی گرنگتر، ئەو پەروەردگارەش هەر یەکە کە بە ڕاز و پێویستییەکانی ئێمە و ئەم شتانەش زانایە...

بێ ئەوەی بەدەست خۆمان بێت، کاتی نانخواردن یان کاتێك بە هەر خۆراکێك گەدەمان تێر بکەین، ناخمان فێنکایی پێدا دێت و، هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکەین.

پەروەردگارم لە خۆم زیاتر خەمم دەخوات!

خوایە گیان، سوپاسگوزارین بۆ ئەو خاکەی دروستت کردووە، بۆ ئەو خۆرەی بە ئاسمانەوە ڕووناکییەکەیت بۆمان پەخش کردووە، بۆ ئەو بایەی دەیبەیت و دەیهێنیت، بۆ ئەو گەڵایانەی کە سەوزیان دەکەیت، بۆ ئەو میوانەی بە لقەکانەوە هەڵتواسیون، بۆ ئەو ئاگرەی خواردنی پێ ئامادە دەکەین.

سوپاسگوزارتم لەسەر ئەوەی منت لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و دونیاوە، بۆ ئەو جەستە ساغ و سەلیمەی پێت بەخشیوم، بۆ ئەو عەقڵەی کە بەهۆیەوە درك بە نیعمەتەکانت دەکەم، بۆ ئەو دڵەی کە بۆ باوەڕهێنان بە زاتی موبارەکت پێت بەخشیوم.

ئەی پەروەردگارم! تۆ بەخشندە و میهرەبانیت (الرحمن)یت، کە هەموو خۆراك و، ڕزق و نیعمەتێك بە زانستی خۆت و بەپێی پێداویستییەکانم پێم دەبەخشیت.

خۆراکم خۆشدەوێت، من حەزم لە خواردنە، لەبەر ئەوەی ناوی پیرۆزی (الرحمن)ی تۆم بیر دەهێنێتەوە...

تۆ ڕۆزیدەر (الرزاق)یت، هەموو ساڵێك، هەموو چەشنە خۆراکێکی خۆش و بەسوودمان بۆ بەرهەم دەهێنیت و، هەرگیز ئێمە بە برسێتی

ناهێڵێتەوە. من هەموو جۆرە میوە و سەوزەیەکم خۆشدەوێت، چونکە ناو و سیفەتی ڕۆزیدەر(الرزاق)ی تۆم بۆ دەردەخات.

تـۆ نیعمەتبەخشـیت، تاکـە خـاوەن و بەخشـەری هـەموو نیعمەتەکانیت.. جگە لە تۆ هیچ کەس ناتوانێت وەرزی بـەهار بهێنێت و، لە لق و پۆپی ڕەقی دارەکانەوە میوەی تەڕوپاراو و ناسک بەرهـەم بهێنێت.. هیچ هێزێك ناتوانێت بـێ لێتێکچوون خـۆر و مـانگ و بـا بـۆ خزمەتی ئێمە بخاتەگەڕ، من هەموو نیعمەتەکانم خۆشدەوێت، چـونکە سیفەتی نیعمەتبەخشیی تۆم یاد دەخەنەوە.

خوایە گیـان، مـن هـەموو شـتێکم لەبـەر نـاوی تـۆ خۆشـدەوێت، هەمیشـە دەڵـێم: (چـەند جـوان بـەدیهێنراوە!)، (چـەند بـەتام بەدیهێنراوە!)، (چەند جوان بەدیهێنەرەکەی دەناسێنێت!)، (دەبێت بەدیهێنەرەکەی زۆر خۆشەویست بێت!) چیتر زمانم بە وتنـی: (چـەند جوانە)، (چـەند بەتامـە)، (چـەند جـوان خـۆی دەنوێنێـت) و، (چـەند دڵگیرە) ڕاناهێنم. لە پاش نانخواردن یان میوە خواردن سوپاسـی تـۆ دەکەم و، دەڵێم: (الحمد لله)، هەموو ئەم نیعمەتانە لەبەر وتنی (الحمد لله) لـە بەهەشـتدا بـە سـیمای بەهەشـتییانەوە دێنـەوە بەردەسـتم، کەواتە هەروەك چۆن من لەم دونیا بەری دار دەخۆم پشت بەخودا لەو دونیاش بەری (الحمد لله) دەخۆم.[1]

---

١- لە (وتەی سی و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# خوای گەورە چی بە ئێمە بەخشیوە؟ ئەی چی دیکەمان پێ دەبەخشێت؟



((ئەی مرۆڤ! ئەو خزمەتەی دەیکەیت و، ئەو بەندایەتییەی ئەنجامی دەدەیت هەروا لەخۆڕا ناڕوات، بەڵکو دیارییەکی بێ وێنە.. خۆشبەختییەکی نەبڕاوە، بەهەشتێکی تاهەتایی لە پاش ئەم ژیانە فانیی و زووتێپەڕەوە چاوەڕێت دەکات)).

پەروەردگارمان ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و، هەموو شتێکی سەر ئەم زەمینەی لەبەر ئێمە ئامادەکردووە.

مانگ و خۆر و ئەستێرەکان لە خزمەتی ئێمەدان.

بەهار، هاوین، پایز، زستان، هەموو وەرزەکان لەبەر ئێمە بەدوای یەکدا دێن. خاک، ئاو، ئاسمان، بێ وەستان لەبەر ئێمە تێدەکۆشن.

ڕووەکەکان، ئاژەڵەکان، هەموو زیندەوەران و بێگیانەکانیش لەبەر ئێمە کار دەکەن و بەرهەمهێنانیان لە ئەستۆیە.

هەموو بوونەوەران لەبەر دەستەبەرکردنی ژیانێکی ئاسوودە بۆ ئێمە بە بەردەوامی ڕەنج دەدەن و، ئەو فەرمانانە جێ بەجێ دەکەن کە لەلایەن بەدیهێنەرەکەیانەوە پێیان دەگات.

ئەو زاتە مەزنە هەموو پێداویستیەکانمان بە زیادەوە پێ دەبەخشێت، واتە بێ هیچ کرێ و بەرامبەرێکیش.

پەروەردگار هیچ پێداویستییەکی نییە، نە پێویستی بە ئێمەیە، نە بە هیچ شتێکی دیکە، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە پێویستمان بە زاتی موبارەکی هەیە.

پەروەردگار هیچ شتێك لە ئێمە داوا ناکات، ئێمە هەموو شتێکمان لەو داوا دەکەین.

ئەو چاوەڕوانی هیچ لە ئێمە ناکات، بەڵکو ئێمەین کە چاولەڕێی میهرەبانیی ئەوین.

ئەو هەر لە سەرەتاوە هەموو پێداویستییە سەرەکی و بنچینەییەکانمانی پێ بەخشیوین، واتە تەنانەت پێش ئەوەی خۆشمان داوای لێ بکەین.



هیچ کەس لە ئێمە داوای خۆری نەکردووە، بەڵام ئەو پێی بەخشیوین.

ئێمە داوای دونیامان نەکردووە، بەڵام ئەو بۆی بەدیهێناوین.

وەرزەکانی بۆ داواکاری ئێمە بەدیهێناوە.

دەریا، ئاسمان، چەندین بوونەوەری دیکەش کە ئێمە هەر درکمان بە سوودیشیان نەکردووە و هەرگیزیش داوامان نەکردوون، خوای گەورە خۆی بۆی بەدیهێناوین، واتە بێ ئاگاداری خۆمان و بەخۆڕایی جەستە و ڕۆح و ژیان و عەقڵ و دڵ و هەموو هەستەکانمانی پێ بەخشیوین.

بەر لەوەی ئێمە چاو بە دونیادا هەڵبێنین: دایکمان، باوکمان، مامان، خاڵمان، پوورمان و، هەموو کەسوکارمانی بەدیهێناوە.

نیشتیمان و شار و دێ و باخچە و چی و چی دیکەشی یەك لەدوای یەك بۆ بەدیهێناوین.

– باشە لە بەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتەدا ئێمە چی بکەین؟ چ ئەرکێك دەکەوێتە سەرشانی ئێمە؟

– ئەرکی سەرشانمان ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە کە لە خزمەت فەرمانەکانی ئەو پەروەردگارەماندا بین کە ئەم بوونەوەرانەی بۆ خزمەتی ئێمە هێناوەتە بوون، هەروەها بیپەرستین و، گوێڕایەڵی هەموو فەرمایشت و فەرمانەکانی بین و بە خۆشەویستییەوە بەجێیان بهێنین.

مادەم ئەو زاتە ئێمەی بە خۆشەویستییەوە خولقاندووە و هەستی خۆشویستنی پێ داوین، کەواتە ئێمەش ئەومان زۆر زۆر خۆشدەوێت.. گەر ئێمەش خۆشمان بوێت، ئەویش ئێمەی زیاتر

خۆشـدەوێت و نیعمـەتی زیاتریشـمان بەسـەردا دەبارێنێـت. بـەم شێوەیە، تا پەیوەندی خۆشەویستیمان بەهێزتر بێت، لـە دواڕۆژیشـدا زیاتر نیعمەتمان بەسەردا دەبارێنێت و، بەهەشت و ژیـانی نـەبڕاوەی ناو بەهەشتمان بەنسیب دەکات.

بڕوابوونمان بە خوای گەورە و، پەرستشەکانی وەك نوێـژ و ڕۆژوو کە لـەپێناوی ئـەودا دەیانکـەین، هـەرگیز بـەخۆڕایی ون نابێـت و، لـە دواڕۆژدا لە بەرگی بەهەشتدا دێنەوە ڕێمان.

پشـت بـەخوا، سوپاسـگوزاریی و، یادکردنـەوە و، بیرکردنـەوە و، پاڕانـەوەکانمان و فرمێسـك و هەنیسـکەکانمان دەبنـە خۆشـییەکی نەبڕاوە و لە دواڕۆژدا هاودەممان دەبن.

چەند جوانە! خـودا هـەم بەهەشتی دروسـت کـردووە، هـەم ئـەو کارانەشی کە ئێمە دەگەیەننە بەهەشت.

ئەمە شتێکی زۆر جوان و سەرسوڕهێنەرە...

کەواتە، ئایا ئێستە ئامادەن بۆ ئـەوەی بەشـداریی لـە پێشـبڕکێی ئیمان و بەندایەتیدا بکەن؟[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەو مژدانەی بەهۆی باوەڕداربوونمانەوە پێمان دەدرێت



گەورەترین و گرنگترین مەبەستی هاتنە دونیامان بریتییە لە باوەڕهێنان بە خودا و، بەرزترین و مەزنترین پلەی مرۆڤایەتیش ناسینی پەروەردگارە.

نوورانیترین و شیرینترین نیعمەتێکیش کە بە مرۆڤەکان بەخشراوە: ناسین و خۆشویستنی پەروەردگارە. پاکترین و خاوێنترین خۆشبەختیش بۆ ڕۆحی مرۆڤ ئەو چێژەیە کە بە خۆشەویستی خودا بەدەستی دەهێنیت.

هەر خۆشبەختییەك کە سەرچاوەکەی بەهۆی خۆشویستنی پەروەردگارەوە ژیابێتەوە بڕانەوەی نییە.

هەرکەسێکیش دووربێت لەم خۆشەویستییە و تامۆچێژی نەکردبێت، ئەوا دەرگای ئازار و نەهامەتیی بەڕووی خۆیدا کردۆتەوە.

**(لا إله إلا الله):**

(لا إله إلا الله) واتە: جگە لە (الله) هیچ پەرستراو و خودایەکی دیکە بوونی نییە.



پێداویستییەکانمان هەرگیز تەواو نابن و، بەڵا و ئازارەکانیشمان لەڕادەبەدەرن.. هەر بۆیە وتنی زیکری (لا إله إلا الله)، دەرگای گەنجینەیەکمان بەڕوودا دەکاتەوە کە توانای دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانمانی هەیە؛ چونکە هەموو شتێك موڵکی (الله)یە و ملکەچی فەرمانی ئەو زاتەیە.

لا إله إلا الله، ئێمە بە هێز و دەستەڵاتێك دەگەیەنێت کە دەتوانێت لە هەموو دوژمن و ناحەز و ئازارێك بمانپارێزێت؛ چونکە ئەو زاتە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت.

بەم شێوەیە، ڕۆح و دڵمان لە ترس و ئازار پارێزراو دەبن و، بە خۆشەویستییەکی نەبڕاوە شاد دەبن.



## خودا (یەك)ە:

**لەم ڕستەیەدا، ئەم مژدە دڵخۆشکەرانەی تێدایە:**

خودا یەکە، کەواتە خۆت بە لەدەرگادانی کەسی دیکەوە ماندوو مەکە و، لەبەردەم هیچ کەسێکی دیکە خۆت بە کەم مەگرە و، منەتی کەس هەڵ مەگرە.. مەبە بە بەندە و کۆیلەی کەسانی تر و سەریان بۆ دامەنەوێنە و، لە بەرچاویاندا زەلیلی مەنوێنە.. بە دەست و قاچ

ماچکردنی کەسانی تر خۆت بێ ڕێز مەکە و، ترس و لەرزت لێیان نەبێت؛ چونکە پادشای گەردوون یەکە..

کلیلی هەموو شتێك بەدەستی ئەو زاتەیە و، خۆی هەموو شتەکان ڕێك دەخات.

هەموو کارێك بە فەرمانی ئەو زاتە دەکرێت.

خۆ ئەگەر تۆش ئەو زاتە بدۆزیتەوە و بیناسیت، کەواتە هەموو شتێکت دۆزیوەتەوە و، لە منەتباری ئەم و ئەو و لە ترس و لەرزی بێ سوود ڕزگارت بووە.



## ئەو زاتە هاوبەشی نییە:

خودا یەکە و، جگە لەویش هیچ کەس و لایەن و هێزێك ناتوانێت هاوشانی بێت.

پەروەردگارمان لە بەڕێوەبردنی گەردوون و، کاروبارپەڕاندن و، بەدیهێنانی بوونەوەردا هاوبەشی نییە.

هەر وڵاتێك یەك پادشای هەیە و، فەرمانبەرەکانی کاروبارەکانی وڵاتەکەی بۆ ڕادەپەڕێنن، واتە ئەو فەرمانبەرانە تاڕادەیەك وەك هاوکاری پادشان و، کاری هەموو کەسێك ناخەنە بەردەستی پادشا، بەڵکو هەر بۆ خۆیان بڕیاری لەسەر دەدەن.

بەڵام خوای پادشای ئەزەلی و ئەبەدی گەردوون، هیچ هاوکارێکی نییە و، هیچ پێویستی بە هاوکار و فەرمانبەر نییە. تەنانەت گەر فەرمان و خواستی ئەو زاتە نەبێت هیچ شتێك لە جێگای خۆی ناکەوێتەکار و نابزوێت.

کەواتە هەر کەس حەزی لە شتێك بوو دەتوانێت ڕاستەوخۆ لە پەروەردگاری داوا بکات، لەبەر ئەوەی پەروەردگار هیچ هاوبەش و هاوکارێکی نییە و، کەسیش ناتوانێت ڕێی لێ بگرێت و ببێتە بەربەرست لە بەردەم دوعا و پاڕانەوەکەیدا.

(لا إله إلا الله) ئەم مژدەیە بە ڕۆحی مرۆڤەکان دەدات:

هەرکەسێك بە تەواوی باوەڕی بە خوای گەورە هێنا بێت، ئەوا لە هەر جێیەك و، لە هەر کاتێکدا داخوازییەکی هەبوو دەتوانێت بێ هیچ بەربەستێك لە پەروەردگاری داوا بکات، ئەوکات سۆز و بەزەیی و دەستەڵاتی ئەو زاتەی بۆ دەردەکەوێت و، تەواو پشتی پێ دەبەستێت و تا بڵێیت ئاسوودەش دەبێت.



## خوای گەورە خاوەنی هەموو موڵك و گەردوونە:

خوای گەورە تاکە و، خاوەنی ماڵ و موڵك و هەموو شتێکی ئەم گەردوونەیە.

واتە تۆ هەم موڵکی ئەویت، هەم بەندەی ئەویت، هەروەها لەسەر موڵکی ئەویش دەژیت و کار دەکەیت.

واتە:

ئەی مرۆڤ! خۆت بە خاوەنی خۆت مەزانە؛ چونکە تۆ ناتوانیت بوون و ژیانی خۆت بەڕێوەبەریت، لەبەر ئەوەی باری ژیان بۆ تۆ زۆر گرانە و ناتوانیت بیدەیت بە شانتدا؛ هەروەک چۆن ناتوانیت پێداویستییەکانی خۆت دابین بکەیت و خۆت لە ئازارەکان بپارێزیت، کەواتە بە دەست گرتن بە ماڵ و منداڵەوە خۆت ئازار مەدە؛ چونکە موڵکی خۆت نین و زاتی پەروەردگار بەدیهێنەر و خاوەنیانە.

ئەو خاوەن موڵکە هەم دەستەڵاتی ڕەها و هەم سۆزوبەزەیی ڕەهاشی هەیە، کەواتە تۆش پشت بە دەستەڵاتی ئەو زاتە ببەستە و خۆت لە سۆز و بەزەیی ئەو بێ بەش مەکە.

بەرۆکی سەختیی و ناخۆشی بەردە و باوەش بۆ ئاسوودەیی بکەوە، ئازار لەیادی خۆت بەرەوە و خۆشی بێنەوە یادت.

ئەم گەردوونەی کە زۆرت خۆشدەوێت و گرنگیی پێ دەدەیت و، هەندێ جار لەبەر بێ دەستەڵاتیت بەرامبەری خەمبار دەبیت، موڵکی خوای خاوەن سۆزوبەزەیی و دەستەڵاتی ڕەهایە.

کەواتە موڵك بە خاوەنەکەی بسپێرە و بۆ ئەوی جێ بهێڵە، سەری خۆت بە نەهامەتییەکانییەوە مەیەشێنە و، دڵی خۆت بە جوانییـەکانی ئاسوودە بکە.

خـــودای کـــارزان و دانـــا بـــە ویســـتی خـــۆی مـــوڵکی خـــۆی هەڵدەسوڕێنێت و بەڕێوەی دەبات، بۆیە تۆش لەکاتی سەرسام بوونت بە بەدیهێنراوێکی لەبیرت نەچێت: (خوا کاری نابەجێ ناکات، تـا کێـو نەبینێت بەفری تێ ناکات).

واتە دەتوانیت لە پەنجەرەکانەوە لە ڕووداوەکـان بڕوانیـت و، زۆر نەچیتە ناو وردەکارییەکانی ژوورەوە.



## سوپاس و ستایش تەنها شایستەی خوای گەورەیە:

سوپاس و ستایش تەنها شایستەی شکۆی پەروەردگارە.

پـەروەردگار خـاوەنی نیعمەتەکانـە و، هـەموویان لـە گەنجینـەی ئەوەوە دەردەچن، ئەو گەنجینەیەی بە هیچ جۆرێك لێی کەم نابێتەوە و کورت ناهێنێت.

ئەگەر سەرنجی ئەم واتایە بدەین دەبینین مژدەی زۆری بـۆ ئێمـە تێدایە، وەك:

ئـەی مـرۆڤ! ترسـت لـە تـەواوبوونی نیعمەتـەکان نـەبێت و، بـۆ لەدەسـتدانیان خـەمبار مەبـە، چـونکە خەزێنـەی میهرەبـانیی خـوای گەورە هەرگیز تەواو نابێت.

بـە بیرکردنـەوە لـە لەدەسـتدانی خۆشـییەکانەوە خـۆت تووشـی سەرئێشـە مەکـە؛ چـونکە هـەر نیعمـەتێك کـە پێـت بەخشـراوە بـەری ڕەحمەتێکی بێ سنوورە، کەواتە گـەر هەسـت بکـەیت خـوای گـەورە نیعمەتێکت لێ دەگرێتەوە، ئەوا بێگومان خـۆی وا بـە باشـتر دەزانێـت بۆت و، بەهۆی میهرەبانییەوە لەو نیعمەتەی خۆی بێبەشت دەکات.

خـۆ ئەگـەر درەختێـك سـاڵێك میـوە و بـەر نـەدات، ئـەوا مـادام درەختەکـە لـەجێی خـۆی مـاوە، ئـەوا بێگومـان وەرزی داهـاتوو بەردەگرێتەوە.

لە ڕاسـتیدا چـێژی سوپاسـگوزاربوونمان لەسـەر نیعمـەتێکی وەك پرتەقاڵ سەد ئەوەندە لە تاموچێژی خـواردنی پرتەقاڵەکـە خۆشـترە، واتە ئەگەر سوپاسگوزار بیت لەسەر نیعمەتێك ئەوا ئەو چـێژە لـەناکاو سەد هێندەی پێشووی دەبێت.

سێو هەر سێوە، بەڵام ئەگەر پادشایەك سێوێکت بەدیاری بـداتێ، ئەوا تـام و چـێژی دەبێتـە هـەزار ئەوەنـدە، وا نییـە؟ بێگومـان وایـە، ئەمەش بەهۆی نەرمیی نواندن و خۆنزیککردنەوەی پادشاوەیە لە تۆ.

کاتێـک دەڵێیـت (الحمـدلله) و سوپاسـی خـوا دەکـەیت لەسـەر نیعمەتێك، ئەوا بیر لە بەخشەری نیعمەتەکە دەکەیتـەوە و، ئـەو زاتـە دەناسـیت و، دڵنیایـت کـە تـەنها ئـەو زاتـە ئـەو نیعمەتانـەت پـێ دەبەخشێت.

ئیدی لە نەرمی نواندنی پەروەردگار بەرامبەر بەخۆت تێ دەگەیت و، قەناعەت دەکەیت کـە هـیچ کـات لـە نیعمەتـەکانی خـۆی بێبەشـت ناکات.

بـەم جـۆرەش چـەن قـات لـە نیعمەتـەکانی خـوای گـەورە چـێژ وەردەگریت.



## تەنها خوای گەورە ژیانی بە زیندەوەران بەخشیوە:

خـوای گـەورە بـەردەوامیی بـە ژیانمـان دەبەخشـێت و، هـەموو پێداویسـتییەکانی زیندووەمانـەوەمان بـۆ دابـین دەکـات، گـرنگترین و مەزنترین ئامانجی ئەم ژیانی دنیایەشمان پەیوەندی بـەو زاتەوەیـە و، تەنها لە ڕێی ئەودا دەست دەکەوێت.

هـەموو میوەکـانی ژیـان بـەری درەختـی سـۆز و میهرەبـانی و دەستەڵاتی پەروەردگارن.



واتە: ئەی مرۆڤ! هێندە بارە گرانەکانی ژیان بە کۆڵتدا مەدە و خۆت ناڕەحەت مەکە و، خەیاڵی کۆتاییهاتنی ژیان تووشی خەڵوەتی غەم و پەژارەت نەکات.

ئەنجامە زووتێپەڕ و بڕاوە و فانییەکانی دونیا وات لێ نەکەن لە مرۆڤبوونت بێ هیوا بیت، چونکە پەروەردگاری (الحي) و (القيوم) ئەم ژیانە هەڵ دەسوڕێنێت و، هەر خۆشی پێداویستی و خەرجییەکانت بۆ دابین دەکات و پێت دەبەخشێت، لەبەر ئەوەی ئامانجی سەرەکیی ژیان و بوونی مرۆڤ و زیندەوەران تایبەت و پەیوەستن بە زاتی موبارەکییەوە.

گەر وا دابنێین جەستەت وەك کەشتییەکە، ئەوا تۆی مرۆڤ تەنها ئەرکی ئاراستەکردن و بەڕێوەبردنی کەشتییەکەت لەسەرشانە، کەواتە ئەرکی خۆت بە باشیی بەجێ بهێنە، تا پاداشتەکەی وەربگریت و چێژی لێ ببینیت.

بیر لە بەهای کەشتیی ژیان و سوودەکانی بکەوە و، لە سۆز و میهرەبانیی خاوەنەکەی ڕابمێنە و، خۆشت بوێت و سوپاسی بکە و، بزانە کە ڕێڕەوەکان و ئەنجامەکانی کەشتیی ژیان لە نامەی کردەوەکانتدا تۆمار دەکرێن و دەنووسرێن و، دەکرێت بەهۆی ژیانی ئەم دنیایەمانەوە ژیانی پڕ چێژ و خۆشیی نەبڕاوەی بەهەشت و پڕ لە ئارامش لەو دنیا بۆ خۆمان مسۆگەر بکەین.



## پەروەردگار مردنی بۆ هەموو زیندەوەرێك داناوە:

خــوای گــەورە بــەهۆی مردنــەوە لــە ئــەرکی ئــەم ژیانــە و دەردەسەرییەکانی ئەم دونیایە ڕزگارت دەکات و، جێ و لانەت لەم دونیا کاتیی و بڕاوەیەوە بۆ جیهانێکی نەبڕاوە دەگوازێتەوە.. هەروەها لە سەختیی و بەرپرسیاریەتییەکانی دونیا ڕزگارت دەکات، تا پشوویەك بدەیت.. وەك ئەوەی پێمان بفەرموێت:

مژدەتان لێ بێت!

(مردن) کۆتایی و نەمان نییە! شتێکی خراپ نییە! ماڵئاوایی لە ئازیزان و لەناوچوون نییە! دابڕانی تاهەتایی نییە، چونکە ڕووداوێکی هەڕەمەکی و ڕێکەوت نییە، بەڵکو مردن پشوو و وچانێکە لەلایەن پەروەردگاری دانا و بەسۆزەوە بۆ ئێمە.

هەروەها مردن ڕووکردنەوە دوامەنزڵگەمانە، گەڕانەوەیە بۆ ژیانی بەختەوەریی و، دەرگای بەیەکگەیشتنەوەمانە لەگەڵ خۆشەویستانمان.



## هـــەموو خێـــر و چـــاکەیەك لــــە دەســـتەڵاتی پەروەردگاردایە:

هەموو چاکە و کردەوەیەکی باش کە دەیکەین، لای خـودا تۆمـار دەکرێت.

ئەی مرۆڤی بەستەزمان! لە ئاست مردندا مەڵێ:

"ئەی هاوار! ماڵ و سەروەتمان بەبادا چوو، هەوڵ و تێکۆشانمان بەفیڕۆ چوو، لەو دونیا بەرفراوان و خۆشەوە هاتینەوە ناو ئـەم گـۆڕە تەسك و تاریکە".

بێ هیـوا مەبـە و هـاوار و ناڵـەش مەکـە، چـونکە هـەموو شـتێکت پـارێزراوە، هــەموو کردەوەیــەکیش نووســراوە، هــەر خزمەتێکیشــت کردبێت بۆت تۆمار کراوە.

پەروەردگارێکت هەیە کە هەموو چاکەکانت دەبینێـت و ئاگـادارە پێیان.

ئـەو ئێـوە لـەم دونیایـە دەبـات و، بـۆ ماوەیــەك لـەژێر خاکـدا دەتانهێڵێتەوە، دواتریش بۆ حزوری خۆیتان دەباتەوە.

چ خۆشبەختییەکە بۆ ئێوە! کە زەحمەت و ناڕەحەتیتان لەسـەر نەماوە و بەرەو ئارامیی و خۆشبەختیی دەڕۆن.

خزمەتکردن و نارەحەتی تەواوبوو، ئیتر ئێوە پاداشتان وەردەگرنەوە.



## خوای گەورە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت:

پەروەردگار تاك و تەنیایە و، دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت.

هیچ کارێك بۆ ئەو زاتە قورس و گران نییە.

بۆ ئەو، دروستکردنی بەهار هێندەی دروستکردنی گوڵێك وایە.

لای ئەو، دروستکردنی بەهەشت هێندەی دروستکردنی بەهار ساکارە.

بوونەوەران و دروستکراوان لە هەموو ڕۆژ و ساڵ و چەرخێکدا بینەر و شایەتحاڵی دەسەڵاتی پەروەردگارن.

واتە:

ئەی مرۆڤ! ئەو خزمەت و پەرستشانەی دەیانکەیت، هەروا بەفیڕۆ ناچن و، شوێنی پاداشت و ڕێزلێنانی تۆ ئامادەکراوە و، لە بەرامبەر ژیانی فانیی دونیاتدا بەهەشتێکی نەبڕاوە چاوەڕێتە!

بڕوا بە بەڵێنەکانی پەروەردگارت لەسەر بەندایەتییەکانت بکە و، پشتی پێ ببەستە.

پەروەردگار هەرگیز لە بەڵێنێکی پاشگەزنابێتەوە و، هەر دەیباتەسەر.

بەهیچ جۆرێك کەموکورتی لە هێز و دەستەڵاتی پیرۆزیدا نییە و، لە کارەکانیدا دەستەوەسان نابێت، لە هەر کاتێکدا ویستی لەسەر هەر شتێك بێت، ئەوا هەر دەیسازێنێت.

چۆن باخچەی ماڵەکەتانی پێ بەخشیون، هەر واش بەهەشتیشی بۆ بەدیهێناون و، بەڵێنی پێداون بیکاتە نسیبتان.

دڵنیابە، لەبەر ئەوەی بەڵێنی پێداویت، ئەوا هەر دەتخاتە بەهەشتەکەیەوە.



## گەڕانەوەی ڕاستەقینە بۆلای ئەو زاتەیە:

- باشە ئێمەی مرۆڤ لەو دنیا بۆ کوێ دەچین و، لەکوێ دەمێنینەوە؟

- ئێمە پشت بەخوا لە کۆتاییدا هەر دەچینە بەهەشت، کە خۆشی و ئاسوودەیی یەك چرکەساتی ئەوێ بەرامبەرە لەگەڵ هەزار ساڵی ئەم دونیایە.. لەوێش بە دیداری خوای بەرز و بڵند شاد دەبین، کە یەك ساتەوەختی بینینی خوای گەورە لە هەزار ساڵ خۆشبەختی

و ئاسوودەیی بەهەشت زیاترە! چونکە جوانییەکان، خۆشەویستییەکان، نیعمەتەکان، سۆز و میهرەبانییەکان تەنها تیشک و پرشنگێکن لە نووری پەروەردگار.

بەم شێوەیە، ئێمەی مرۆڤ خوای گەورە دەبینین و، بۆ هەتاهەتایە لەگەڵ ئەودا دەمێنینەوە و لە بەهەشتەکەی ژیان دەگوزەرێنین.

کەواتە با بە زەردەخەوە خۆمان بۆ مردن ئامادە بکەین، نەک بە شیوەن و گریانەوە.[1]



---

١- لە (مەکتووبی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# خۆر ئەركی چییە؟ چۆن كار دەكات؟



ئەو خۆرە زەبەلاحە لە بۆشایی ئاسماندا وەستاوە بێ ئەوەی بە هیچ شتێكەوە هەڵواسرابێت و، پاڵی بە هیچ شتێكەوە دابێتەوە. ملیۆنەها ساڵە وەك چرایەك داگیرساوە و دەسووتێت، نە سوتەمەنییەكەی تەواو دەبێت، نە ڕووناكییەكەشی كەم دەكات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە قەبارەكەی ملیۆنێك جار لە زەویی ئێمە گەورەترە.

– باشە بۆ دابینكردنی سووتەمەنی یەك ڕۆژی (خۆر) چیمان پێویستە؟

– بەقەد هەموو دەریا و زەریاكان نەوت و، هێندەی هەموو شاخەكان خەڵووز و هەزار هێندەی دونیاش داروتەختەمان پێویستە بۆ ئەوەی ئاگرەكەی (خۆر) نەكوژێتەوە.

ئێمە تەنها بە نزیکەیی پێشبینیی ئەم برە سووتەمەنییەمان کرد ...

باشە خۆ دەڵێن: خۆر ملیۆنەها ساڵە وەك چرا دەسووتێت، ڕۆژێك نییە و دووان نییە و ساڵ و دوو ساڵ نییە، ئەی چۆن و بۆچی ناکوژێتەوە؟ سووتەمەنییەکەی لەکوێوە دێنێت؟ کێ سووتەمەنی پێ دەدات؟

خۆر هێندە کاری هەیە کە لە ژماردن نایەن!

ژیانی سەر زەوی بەوەوە بەندە، ئەگەر پەیوەندی خۆر و زەوی بۆ یەك خولەك بپچڕێت و تیشکی خۆر لە زەوی نەدات، ئەوا هەموو شتێك دەیبەستێت و، دەبێت بە سەهۆڵبەندان، واتە هیچ زیندەوەرێك لەسەر زەوی نامێنێت و هەموویان لە سەرمادا ڕەق دەبنەوە و دەمرن!

ئەگەر بیر لە پێچەوانەی ئەوە بکەینەوە، واتە ئەگەر زەوی و خۆر چەند سانتیمەترێك لە یەکتری نزیك ببنەوە، ئەمجارەیان هەموو شوێنێکی سەر زەوی دەسوتێت و، ڕووی زەوی هەمووی دەبێت بە بیابان.



خۆر چرایەکە، سەرچاوەی ڕووناکییە، ڕۆشنکەرەوەیە، واتە هەموو دونیا ڕووناک دەکاتەوە: شارەکەمان، گەڕەکەکەمان، ماڵەکەمان، تەنانەت بەرچاوی خۆشمان.. بێ بەرامبەر و هەقدەستیش کار دەکات.

خۆ ئەگەر ئەم خۆرە لەبەرامبەر تیشکەکانی داوای پارەی لێ بکردینایە، چۆن چۆنی و چەنێکمان دابین بکردایە بۆی!

تیشکەکانی ڕووناکی خۆر بێزارکەر نین، بێتاقەتت ناکەن و، بە خۆشەویستییەوە لە ئامێزت دەگرن.

خۆر بە شێوەیەك بەدیهێنراوە کە پێداویستییەکانی زیندوومانەوەمان بۆ دابین بکات.

خۆر تەباخ یا فرنێکە، وەك مەتبەخێکی گەورە وایە، وەك مەنجەڵێکی زەبەلاحە، کە خواردن و خواردنەوەکانمان بۆ لێدەنێت بێ ئەوەی بیانسوتێنێت، یان وشکیان بکاتەوە.

هەموو سەوزەکان: کولەکە، باینجان، بیبەر، مەعدەنوس، گوێزەر... هەروەها هەموو میوەکان، سێو، پرتەقاڵ، هەرمێ، ترێ، گێلاس، گوێز، قەیسی، قۆخ،... هەموو ئەمانەمان بەشێوەیەکی وا ڕێك و پێك بۆ پێ دەگەیەنێت کە لەگەڵ دەم و گەدەی ئێمەدا بگونجێت.

ئەم خۆرە جوانە بەدرێژیی ساڵ و، وەرز و، هەموو کاتێك بێ وچان و بێ ماندوبوون هەر کاردەکات.

– تۆ بڵێی ئەم هەموو کارە لە کوێوە فێربووبێت؟ یا کێ فێری کردبێت؟

خــۆر وەك ســـۆپایەك، یــا ئاگردانێــك، یــا گەرمكـــەرەوە و هەواخۆشـكەرێك وایـە، كـە بـەپێی كـات و شـوێن و، بـەپێی وەرز و ڕۆژەكان پلەی گەرمیی زەوی ڕێك دەخات.

پلـەی گـەرما لـە بەیانیانـدا جیـاوازە لـە نیـوەڕوان، عەسـرانیش جیاوازە لە ئێواران... وەرزی بەهار جیاوازە لە هـاوین، زسـتانیش بـە ڕێژەیەكی كەم و جیاواز تیشكی گەرمی خۆرمان پێ دەگات.

خـاك گـەرم دەكاتـەوە، هـەروەها دەریاكـان و، هـەوا و كەشـی ماڵەكانمان و، خۆشمان گەرم دەكاتەوە، كەچی نامانسوتێنێت.

تۆ بڵێی چۆن و بە چـی لـە كارەكانیـدا ئەوەنـدە كارامـە و لێـزان بووبێت؟ ئەی ئەم وزەیەی لە كام سەرچاوەوە وەرگرتـووە؟ فـەرمانی لە كێوە وەرگرتووە؟



## خۆر سەرچاوە و كانی و بناغەی هەموو ڕەنگەكانە:

هەموو بوونەوەران لـە خـۆرەوە ڕەنگـەكانیان وەردەگـرن.. واتـە ڕەنگی سەوزی گەڵاكان، زەرد و سوور و پەمەیی گوڵەكان... سپێتیی كۆتر و، سەوزیی بۆق و، ڕەنگاوڕەنگی كەڵەشێر و، هەموو ڕەنگەكانی سەر كلكی تاوس و، شینیی ئاسمان و، زەرد و ڕەش و سووری خـاك،

هەموو ڕەنگەکانی دەریاکان... لە زەوییەوە تا ئاسمان، هەموو شتەکان بەهۆی خۆرەوە ڕەنگ کراوە و ڕازێنراوەتەوە.

خۆر لەبەر ئێمە و بۆ ئێمە کاردەکات، واتە خزمەتی ئێمە دەکات و، کارەکانمان بۆ ئاسان دەکات.

هەموو ئەم کارانەی لە یەك کاتدا ئەنجام دەدات، بێ ئەوەی هیچ کارێکی لێ تێك بچێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە تا ئەو ئاستەی ئێمە زانیارییمان لەبارەیەوە هەبێت: خۆر نە عەقڵی هەیە و نە ڕۆح و نە زانست.

نە ئێمە دەناسێت و، نە دونیا، کەسمان ناناسێت.. واتە بێ ئەوەی بمانناسێت، هەرچی پێداویستییەکمان پێی هەبێت بۆمان دابین دەکات و، وەك ئەوەی بمانناسێت یارمەتیمان دەدات و کارەکانمان بۆ ئاسان دەکات.

خۆر ئەرکەکانی خۆی بە باشیی و بێ هیچ کەمتەرخەمییەك بەجێ دەهێنێت، هەرگیز ئەرکێکی سەرشانی فەرامۆش ناکات، یان دوای ناخات، ئەوە کارنەکردن لای ئەو هەر نییە..

بەڕاستی بەدیهێنەرەکەی جوانی دروست کردووە، وەستاکەی چاکی وەگەڕخستووە. بەڕاستی ئەوەی گڕی تێبەرداوە چاکی دەسووتێنێت، ڕووناککەرەوەکەشی زۆر جوان پرشنگداری کردووە، بەڕاستی فێرکارەکەی جوانی فێرکردووە.

دەبێت یەکێك هەبێت کە ئێمـە و دونیـا و خـۆر بناسـێت، تـا ئـەم هەموو کارە ئاوا بە باشیی بەڕێوەبەرێت.

دەبێـت کەسـێك هـەبێت کـە فـەرمان بـە خـۆر و دونیـا و ئێمـەش بدات، بۆ ئەوەی ڕێ نەدات کارەکان لە ڕێڕەوی خۆیان لابدەن.

هەزاران و ملیۆنان سـوپاس بـۆ ئـەو زاتـەی کـە خـۆر و زەوی بـۆ خزمـەتی ئێمـە خسـتووەتە کـار، بـە ژمـارەی ئەسـتێرەکان و، بـە ئەندازەی دلۆپە دلۆپی ئاوی دەریاکان سوپاس و ستایش بۆ ئەو زاتـە مەزنە.[1]



---

١- لە (وتەی سی و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەو زاتە بە گشت نهێنییەکانمان دەزانێت



**"ناگونجێت هیچ شتێك لە پەروەردگار شاراوە بێت، هەموو شتێك لە بازنەی بینین (نظر) و لە بازنەی شایەتحاڵیی (شهود)ی خوای گەورەدایە، ئەو زاتە وردەکاری هەموو شتێکی لەلایە".**

گەر ڕۆژێك بەتەنیا لە ماڵەوە بم و، بە تاقی تەنیا لە ژوورەکەمدا دانیشتبم، دەرگا و پەنجەرەکانیش داخرابن، خۆ ئاوا کەس ناتوانێت بمبینێت، واتە دەتوانم چیم ویست بیکەم، من سەربەستم، وا نییە؟

بەڵام یەکێك هەیە، کە من لە خۆم باشتر دەناسێت، ئەو هەموو نهێنی و نەزانراوەکانی من دەزانێت و، دەستەڵات و توانای لەسەروو هەموو کەس و شت و هێزێکەوەیە و، هەموو کارەکانی من دەبینێت و ئەنجامەکەشی دەزانێت.

کاتێك نان دەخۆم، خۆراکەکە دەچێتە گەدەمەوە، ئیتر لەپاش ئەوەوە چی ڕوودەدات و، چی بەسەر دێت، من ئاگادار نیم لێی، نە دەیبینم و نە دەزانم چی لێ دێت، بەم شێوەیەش ئەوەی کە دەیخۆم دەبێت بە وزە و لە ڕێی خوێنەوە بە هەموو جەستەمدا بڵاودەبێتەوە.

لە ڕاستیدا تەنها گەدە بەم شێوەیە نییە، بەڵکو هەموو ئەندامەکانی جەستەمان بەم شێوەیە کار دەکەن، بەتایبەتی ئەندامەکانی هەناو (ناوسك)مان.

هەروەها مێشکم بێ ئاگاداریی من خۆی زۆرینەی کار و چالاکییەکانی دەکات، واتە تەنانەت ناشزانم کە ئێستە چی لە خانەکانی مێشکمدا ڕوو دەدات، هەموو کارەکانی دوور لە زانستی من ئەنجام دەدات.

کەواتە هەر ئەو زاتەی منی بەدیهێناوە کارەکانی جەستە و ڕۆحیشم بۆ هەڵدەسوڕێنێت و، هەرچی شتێك بۆ جەستە و ڕۆحم پێویستە ئەو زاتە بەدیهێناوە.

هەر ئەو زاتەیە کە وادەکات چاوم ببینێت و، مێشکم کار بکات.. واتە ئەو زاتە من دەناسێت و، هەموو کات دەمبینێت و، هەموو پێداویستییەکیشم پێ دەدات، هیچ شتێك نییە سەبارەت بە من کە پەروەردگار لێی ئاگادار نەبێت، کەواتە ناتوانم هیچ شتێك لەو بشارمەوە.

کەسانی دەوروبەرم دەتوانن هەڵسوکەوتم ببینن و، گوێیان لە دەنگم بێت.. بەڵام هیچ کەسێك نازانێت چی لە ناخمدایە، یان بیر لە چی دەکەمەوە، یاخود بەنیازم چ کارێك بکەم، تەنانەت زۆربەی کاتەکان هەر لێشم تێناگەن، چونکە خوای گەورە هەموو مرۆڤێکی بەم شێوەیە بەدیهێناوە.

بەڵام زاتێك هەیە کە دەزانێت خەیاڵ و بیر و هزرم لەکوێیە و، چیم لە مێشکدایە.. لە ڕاستیدا دەبێت زاتێکی وا هەر هەبێت..

– باشە ئەو زاتە کێیە؟

– ئەو زاتەیە کە خۆت و عەقڵ و ڕۆح و هەستەکانی بەدیهێناوە. دەی کە ئەو عەقڵی پێدابین، هەر خۆشی دەزانێت کە ئەمانە چۆن کاردەکەن و، بیر لە چی دەکەینەوە؛ بەهەمان شێوەش دەزانێت چی لە ناخماندا ڕوودەدات و، چ هەستێك زاڵە بەسەرماندا؛ چونکە هەر ئەو زاتە لە بنەڕەتەوە هەستەکانی پێداوین.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (ئایا کەسێ ئەم خەڵکەی دروست کردبێ، بە خەیاڵاتی دڵیان نازانێ، کە زانستیشی ئەگاتە هەموو دەر و ناو و نهێنی و ئاشکرای ئەم خەڵکە؟) الملك: ١٤.



بەدڵنیاییەوە دەیناسێت و لە بارودۆخی ئاگادارە.

کەوابوو من دەتوانم چ شتێك لەو زاتە بشارمەوە؟

تەنانەت چ پێویست دەکات هیچ لە خوایەکی هێندە میهرەبان و دانا و بەدەستەڵات بشاریتەوە؟

- ئێستە تێگەیشتین کە خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکی ئێمەیە. بەڵام ئایا تێگەیشتن لەمە چ سوودێکی بۆ ئێمە هەیە؟

- گەر زانیمان خوای گەورە بە ناخی ئێمە ئاگادارە، قەناعەت دەکەین کە ئەو زاتە هەموو ڕاز و نیاز و نهێنییەکیشمان دەزانێت، ئەمەش شتێکی زۆر جوان و سەرسوڕهێنەرە.

- بۆچی؟

- ئاخر کاتێك ئێمە هەست بکەین خوای گەورە ئاگای لە هەموو شتێکمانە زۆر ئاسوودە و دڵنیا دەبین.

مەگەر تۆ چی لە خۆشەویستترین و نزیکترین هاوڕێت دەشاریتەوە؟! هەموو شتێکی لا باس ناکەیت؟! هەموو ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکان و خەمەکانتی لا هەڵ ناڕێژیت؟! هەموو نهێنییەکانتی لا نادرکێنیت؟!

بێگومان هەموو شتێکی خۆتی لا باس دەکەیت، دەزانیت بۆچی؟ چونکە متمانەت پێیەتی و، خۆشت دەوێت، لەبەر ئەوەی لە کاتی پێویستیشدا یارمەتیت دەدات.



له ڕاستیدا ئێمەی موسوڵمان هەموو نهێنییەکانمان لای خوای گەورە دەدرکێنین و، پێویستییەکانمان لەو داوا دەکەین، هەروەها لە کاتی دوعا و پاڕانەوەکانماندا دان بەو گوناهانەماندا دەنێین کە

تەنانەت لای نزیکترین کەسیشمان باسیان ناکەین؛ چونکە پەروەردگار ئێمــە دەناســێت و، دەزانێــت چــیمان کــردووە و چــی دەکــەین و، پێویستمان بە چی هەیە. خۆ هەر خۆی هەموو پێداویستییەکانمان بـۆ دابین دەکات و، تەنها ئەو بەتەواوی لە گوناهەکانمان خۆش دەبێت و، تاوان و کەموکورتیی و کەمتەرخەمییەکانمان ناداتەوە بە چاوماندا و، بۆمان دەشارێتەوە.

ئەوەتا یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە: (السَتَّار)ە، واتـە ئــەو زاتــەی کــەموکورتیی و هەڵــە و تاوانــەکانمان دادەپۆشــێت و، پارێزەری گشت نهێنییەکانمانە.

هەر بۆیە ئێمە خودامان زۆر خۆش دەوێت و، هەوڵ دەدەیـن لێـی نزیك ببینەوە و، ئەو کارانـە بکـەین کـە لای ئـەو زاتـە خۆشەویسـتن.. هەورەها بۆ ئەوەی خۆشەویستیی ئەو لە دەست نەدەین و، لێـی دوور نەکەوینەوە و هەمیشـە هەسـت بـە نزیـك بوونمـان بکـەین لێـی و، بـۆ بەدەســـتهێنانی ڕەزامەندیشـــی فرمانـــەکانی بـــە خۆشەویســـتی و دڵنیاییەوە بەجێ دەهێنین و، خۆمان لە گوناه و تاوان دەپارێزین.

لەبـەر ئـەوەی خـوای گـەورە بـە ڕاز و نهێنییـەکانمان ئاگـادارە، ئێمـەش کاتێـك هەڵەیـەك دەکـەین زۆر دڵتـەنگ نـابین و خـەم دامـان ناگرێت، دڵئارام و ئاسوودەشین کە خوای گەورە پـاش تەوبـەکردنمان لێمان خۆش دەبێت.

گەر بۆ یەك ساتیش بووە، پێچەوانەی ئەم دۆخە بهێنیتە بەرچاوی خۆت؛ واتە: گەر کەسێکی دەمشڕ و هەڵەشە و بێ ئابڕوو بە نهێنییەکت بزانێت، خەمبار و نیگەران و بی تاقەت نابیت؟

بەڕاستی ئێمە زۆر خۆشبەتین کە تاکە خۆشەویست و دۆستی ڕاستەقینەمان خودایە و بەتەواوی متمانەی پێ دەکەین، تاکە پشت و پەنامان خودایە و، لە خۆمان باشتر دەماننناسێت.

بەڕاستی ئیمان ئارامی و دڵنیایی و ئاسوودەییەکی زۆرمان پێ دەبەخشێت! [1]

---

١- لە (وتەی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئیمان چۆن تازە دەبێتەوە



– ئایا جلوبەرگەکانمان کۆن دەبن؟

– بێگومان بەڵێ.

– ئەی جانتا و کتێب و دەفتەرەکانی مەکتەبمان کۆن دەبن؟

– بەڵێ، کۆن دەبن و دەدڕێن.

– ئەی ئۆتۆمبێل و خانوو؟

– ئەوانیش هەر کۆن دەبن.

– چی لەو شتانە دەکەین کە کۆن دەبن؟

– ئەگەر چاك بکرێنەوە، ئەوا چاکیان دەکەینەوە. ئەگەر نا، ئەوا لە جێی هەر شتێك دانەیەکی تازە دەکڕین.

– گەر هەموو ئەو شتانە کۆن ببن کە بەکاریان دەهێنین، کەواتە ئەی خۆمان؟ واتە چاو و دەست و گوێ و دەم و لووت و جەستەمان هەر وەك خۆیان دەمێننەوە؟

– نەخێر، هەروا نامێننەوە، ئەوانیش نەخۆش دەکەون و کۆن دەبن.

– ئەی کە ئەوانە کۆن بوون چی دەکەین؟

– دەچینە لای پزیشك و، دەرمان وەردەگرین، تا چاك دەبینەوە. وەك ئەوەی نوێ بووبێتینەوە!

– گەر کەلوپەل کۆن ببێت و، ئەندامەکانی جەستەمان نەخۆش بکەون، کەواتە ئەی ئیمانەکەمان هەر وەك خۆی بە سەلامەتی دەمێنێتەوە؟

– بەداخەوە، ئیمانیش کۆن دەبێت و، دەشێوێت.

کاتێك کەلوپەل و شتەکانمان چاك دەکەینەوە وەك تازەیان لێ دێتەوە، کە نەخۆشیش دەکەوین دەرمان وەردەگرین و چاك دەبینەوە.. باشە ئەی چۆن ئیمان نوێ بکەینەوە؟

خۆ ئیمان شتێك نییە بە چاو ببینرێت یان بەدەست بگیردرێت تا چاکی بکەینەوە!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "باوەڕ لـە نـاخ و دەروونتانـدا وەك بەرگ و پۆشاك كۆن دەبێت، بۆیە لە خوا بپاڕێنەوە تا بـاوەڕ لـە دڵ و دەروونتاندا نویێ بكاتەوە".[1]

– ئەو شتە زیانبەخشانە كامانـەن كـە ئیمانمـان كـۆن دەكـەن و، دەیشێوێنن و، كەمی دەكەنەوە؟

سـەرەتا، ئێمـەی مـرۆڤ هـەموو كاتێـك لـە هـەمان بـارودۆخی دەروونیدا نین و، هەر لە هەمان حاڵی ڕۆحیشماندا نامێنینەوە، بـەڵكو زوو زوو گۆڕانمان بەسەردا دێت.

ڕەنگە كەسێك تاوێك زۆر دڵخۆش و دەم بە پێكەنین بێت، كەچـی پاش كاتژمێرێك وەك ڕۆڵەی باوك مـردووی لـێ بێـت و خـەم و پـەژارە دایبگرێت.

هەندێك جار (نوێژی نیوەڕۆ) لـە كەشـێكی ئیمـانیی و ڕۆحیـی پـڕ چێژدا دەكات، كەچی بۆ نوێژی عەسر ئەو كەشەی بۆ ناسازێنرێت.

---

١– المستدرك الحاكم: ٥

هەندێك جار تووشی تاوانێك دەبین، كە بەهۆیەوە ڕۆحمان ئۆقرەی لێ دەبڕێت، ئیتر تەواو خەمبار دەبین و، هەزار جار پەشیمان دەبینەوە لەو كارەی كردوومانە، بۆیە هەر زوو تەوبەی لەسەر



دەکەین، بەم شێوەیە لەبەر یەك سات پشتگوێخستنی ئیمانمان دەکەوینە چاڵی گوناهەوە.

ئێمە بۆ پاراستنی ساغ و سەلامەتیی باوەڕبوونمان بە خودا و، بۆ کاڵ نەبوونەوەی پەیوەندی خۆشەویستیمان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، هەرچییەکمان لەدەست بێت دریٚغیی ناکەین، بەڵام ناحەز و دوژمنە شاراوەکانمان هەروا دەستەوەسان ناوەستن، بەڵکو تا لا دەکەینەوە هەر ئەوەندە دەزانین خورپە و بێزاریی و بێتاقەتیی بە دڵماندا دەهێنن.

– ئەم دوژمنانە کێن؟

– یەکەم ناحەز و دوژمنی هەرە سەرسەختمان، کە بۆ تەنها ساتێکیش چاومان لێ غافڵ ناکات، شەیتانی نەفرەتلێکراوە.. پاشان نەفسی بەدکار و گێرۆدەی دەستی شەیتان، کە مرۆڤ بەرەو گوناهەکان ڕادەکێشێت...

شەیتان بۆ ئەوەی ئێمە لە خودا دووربخاتەوە پەنا بۆ فێڵی زۆر خراپ دەبات، تا بیر و خەیاڵ و عەقڵمان بە شتی بێ ماناوە سەرقاڵ بکات، واتە خەیاڵی زۆر پڕوپوچ و وێنە و وتەی ناشیرین بە خەیاڵماندا دێنێت، بۆ ئەوەی تووشی وەسوەسەمان بکات، تەنانەت خەیاڵی سەیر و سەمەرەمان دەربارەی خودا بەبیردا دێنێت و، لەدوای ئەوەش

پێمان دەڵێت: (سەیرکە، ئەها دڵت چەند خراپ بووە و، بە شتی چۆنەوە مەشغوڵ بووە !)، تا بەم شتانەش ورەمان دەڕوخێنێت.

ئەو کەسە ساویلکانەی بەم فێڵانەی شەیتان دەخەڵەتێن.. ئیتر هێواش هێواش شەیتان وایان لێ دەکات گومان لە ئیمانیان بکەن، بەم جۆرە تا دێت ئیمانیان لاوازتر دەکات، تەنانەت بێ ئەوەی هەست بە خۆشیان بکەن.

ئەگەر کەمێك سستی لە ئیرادەماندا هەبێت، یا زانیاریمان دەربارەی بابەتە ئیمانییەکان کەم بێت، یا وەك پێویست خۆمان لەسەر خۆڕاگری پەروەردە نەکردبێت، یا دووربین لەو زانیارییانەی ئیمانمان پتەو دەکەن، ئەوا ڕەنگە ئەم فێڵ و داوانەی شەیتان کاری خۆیان لەسەر دەروونمان بکەن و، فریومان بدەن و سەرمان لێ بشێوێنن.

پێویستە هەوڵ بدەین ڕووبەڕووی ئەم شەیتانە لە ڕێ دەرچووە ببینەوە، کە هەوڵی کوژاندنەوەی نووری ئیمانمان دەدات.

بە تێڕامان و بیرکردنەوە و ڕوانینمان لە هەر بوونەوەرێك هەست بە نزیك بوونەوە دەکەین لە خودای گەورە، چونکە هەموومان بە ویستی ئەو زاتە هاتووینەتە بوون؛ خۆ بارانبارین هەروا لەخۆوە نییە، پشکوتن و کرانەوە و گەشانەوەی خونچەی گوڵێك لەخۆوە نییە، ئەو خواردنەی دەیخۆین بە هەرەمەکی تێکەڵ بە خوێنمان نابێت، ڕۆژ

لەخۆیـــەوە هەڵنایـــەت و لەخۆیـــەوە ئـــاوا نابێـــت، وەرزەكـــان هـــەروا بەڕێكەوت بەدوای یەكدا نایەن، تەنانەت یەك بەرد یا یەك مشـت خـۆڵ لەخۆڕا دروست نەكراوە، هەموو شتێك كە لە دونیادا هەیە بە فەرمانی بەدیهێنەر و بەڕێوەبەرێك كاردەكات.

بـەپێی ڕوونكردنـەوەكانی قورئـانی پـیرۆز، هەركەسـێك بـەهۆی پتـەویی باوەڕەكەیـەوە تـێ بگـات كـە هـەموو شـتێك بـۆ هۆكارێـك بـەدیهێنراوە و هـەموو بوونـەوەرێك ئـەركێكی لەسـەر شـانە، ئـەوا بەردەوام باوەڕ پارێزراوە و دوورە لە مەترسییەوە.[1]

---

١- لە (مەكتووبی بیست و پێنجەم)ەوە وەرگیراوە.

## شەیتان بۆچی بەدیهێنراوە؟



– شەیتان چیە؟

– سەرچاوەی هەموو خراپەکانە.

– شەیتان چی دەکات؟

– مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێت.

– ئەی ئەگەر بەگوێی شەیتان بکەم، چی دەبێت؟

– گوناه و تاوانت کردووە.

– ئەگەر گوناه بکەم، چی دەبێت؟

– وەك ئەوەیە کە دژایەتی خودات کردبێت.

– گەر وایە، ئەی کێ شەیتانی بەدیهێناوە؟

– بەدڵنیاییەوە خودای گەورە.

– باشە خوای گەورە بۆچی و لەبەر چی بەدییهێناوە؟ مەگەر دروستکردنی شەیتان شتێکی خراپ و ناشیرین نییە؟ خۆ سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەکان شەیتانە!

– نەخێر، بەدیهێنانی شەیتانی ناحەز کارێکی خراپ نییە، بەڵکو تەنها گوێڕایەڵی کردنمان بۆ شەیتان کارێکی خراپە.

– یەعنی چی؟

– با نموونەیەك بهێنینەوە: باشە ئاگر کاری چییە؟

– سووتاندن.

ئەگەر بڵێین خودا بۆچی ئاگری بەدیهێناوە؟ بڕوا ناکەم لەوەڵامدا ئەوەمان بەبیردا بێت کە بڵێین بۆ سووتاندنی دەست و ماڵ و سەروەتی مرۆڤ بێت.

– کەواتە بۆچی بەدیهێنراوە؟

بۆ ئامادەکردنی نان و ژەمەخۆراکەکانمان، بۆ گەرم بوونەوەمان، هەروەها لەبەر ئەوەی ئاگر لە پیشەسازیی ئاسن و فافۆن و ئەلەمنیۆمدا بەکاردێت، ئەوا بە دایکی تەکنەلۆجیاش دادەنرێت.

واتە بە کورتی و پوختی: خودا ئاگری بۆ ئەوە بەدیهێناوە کە سوودی لێ ببینین، تا ئێمە چۆنمان بوێت بۆ ئاسانکردنی ژیانی خۆمان بەکاری بهێنن.

کەواتە ئاگر بەتەواوی بۆ چاکە و خێری بوونەوەران بەدیهێنراوە.

باشە ئەی ئەگەر تەباخی ماڵەوەمان داگیرساند و لەماڵ چووینە دەرەوە پاش کەمێك ئاگر لە ماڵەوە بەرزبوویەوە، هەڵە لە خودی ئاگرەکەوەیە یان لە کەمتەرخەمیی و فەرامۆشکاریی ئێمەوەیە؟

بەدڵنیاییەوە هەڵەکە لە خۆماندایە، چونکە ئاگر بۆ سووتاندنی ماڵەکەمان بەدینەهێنراوە، بەڵکو ئێمە بەدەستی خۆمان ماڵی خۆمان سووتاند و، ئەو ئاگرەمان کردە دوژمنمان کە خۆراکی پێ لێ دەنرێت.



کەواتە دەبێت خۆمان فێری شێوازی سوودوەرگرتن لە ئاگر بکەین، چونکە تەنها لە کاتێکدا بە نەزانی ئاگرمان بەکارهێنا، تووشی زەرەر و زیان دەبین، دەنا خودی ئاگر بۆ سوود و بەرژەوەندیمانە.

دەی شەیتانیش بەهەمان شێوەیە.. پەروەردگاریش خۆی شەیتانی بەدیهێناوە و، لە قورئانی پیرۆزیشدا فەرموویەتی:

(شوێن هەنگاوی شەیتان مەکەون) النور: ٢١.

گەر گوێڕایەڵی شەیتان نەبین، ئەو کات تەنها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا دەبین و دەبینە خۆشەویستی پەروەردگار، لە ئەنجامیشدا بە نیعمەتێکی بێ هاوتای وەك بەهەشت شاد دەبین.

سەیر بکەن بارودۆخەکە چۆن گۆڕا! گەر بەم شێوەیە ڕەفتار بکەین، ئەوا خۆپاراستن و گوێڕایەڵی نەکردنمان بۆ شەیتان بووە هۆی چوونە بەهەشتمان.

هەروەك ئەو کەسەی کە بە ژیریی خۆی سوود لە ئاگر وەردەگرێت، ئێمەش دەتوانین ژیر بین و بەهۆی خۆلادانمان لە شەیتان سەرفرازی دواڕۆژ بین، واتە شەیتان بکەینە هۆکاری چوونە بەهەشتمان نەك هۆکاری هەڵە و تاوان کردنمان.

گەر حەزدەکەن، با نموونەیەکی دیکە باس بکەین:



باران ڕەحمەت و بەرەکەتە، ئەوەتا ڕووەکەکان، ئاژەڵەکان، مرۆڤەکان، خاك، هەموو شتێك پێویستی بە باران هەیە، هەموو بوونەوەرێك بارانی خۆش دەوێت...

هەندێك جار وشكەساڵی دەبێت، واتە چەندین مانگ، باران نابارێت، بۆیە ئاوی دەریاچەكان وشك دەكەن و، زەوی وەك بیابانی لێدێت، بەرهەم و باخ و باخاتی كشتوكاڵیی زەرد و مات هەڵدەگەڕێن.

– باشە مرۆڤەكان بۆ چارەسەری ئەمە چی دەكەن؟

– دەچنە دەرەوەی شار بۆ نوێژ و نزای باران بارین و، داوای باران لە خودا دەكەن.

ڕۆژێك دێت، كە تێیدا ئاسمان هەوری چڕ دایدەپۆشێت، دەنگ و ڕووناكیی هەورە بروسكە و هەورە گرمەكان بەناو یەكدا دەچن، پاشان بارانێكی بەلێزمە دەبارێت.

بۆنێكی زۆر خۆش لە خاكەكەوە دێت، درەخت و بەروبوومەكان ئاو دەخۆنەوە، دەریاچەكان پڕدەبنەوە، ئاژەڵەكان تێرئاو دەبن و، مرۆڤەكانیش دەكەونە جەژن و خۆشی و شادی.

لەولاشەوە دەبیستیت وا ماڵی داماوێك پڕبووە لە ئاوی لافاو، هەموو شتێكی كەوتۆتە ئاوەكەوە، جگە لەمەش خاوەن ماڵ هێندە لەبەر باران ماوەتەوە تا نەخۆش كەوتووە، واتە بەكورتی خاوەن ماڵی بەستەزمان هەموو دارونەداری لەدەست داوە.

گەر هەوڵ بدەیت دڵنەوایی بكەیت و لێی بپرسی:

– چی بووە؟



دەڵێت:

- باران باری و ئاوای لێ کردین!

ئێستا ئەم کەسە دەتوانێت بڵێت: "وەڵا باران خێری تێدا نییە و، هەر شەڕە و، شتێکی بێ کەڵکە"؟

نەخێر، مافی ئەوەی نییە؛ چونکە زۆر کەس سوودیان لە بارینی بارانەکە وەرگرتووە و، تەنها کەسانی وەک ئەم کەسە زیانیان پێگەیشتووە.

– بۆچی؟

– چونکە خانووەکەی لە جێگەیەکی باشدا دروست نەکردووە، یان هەموو بارودۆخەکانی لەبەرچاو نەگرتووە.

واتە کابرا بارانی پڕخێری کردووەتە دوژمنی خۆی و، ڕەحمەتی کردووە بە سزا بەسەر خۆیەوە.

کەواتە، هەروەك چۆن ئەوانەی زیانیان بەردەکەوێت بەهۆی بارانبارینەوە ناتوانن گلەیی و گازندە لە بەدیهێنانی نیعمەتی باران بکەن، بەهەمان شێوەش ئەوانەی بە قسەی شەیتان دەکەن و تووشی تاوان دەبن، مافی ئەوەیان نییە ڕەخنە لە بەدیهێنانی شەیتان بگرن و، بە کارێکی خراپی بزانن.[1]

---

١– لە (مەکتووبی دوازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# تەنها خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیی هەموو گیانلەبەرێك دەدات



(پێویستە ڕۆزیدەر ئەوانە بناسێت کە پێویستیان بە ڕزقی ئەو هەیە، هەروەها کاتی بەخشینەکەی بزانێت، لەپاشان بەشێوەیەکی شیاو ڕزقیان بدات).

– خۆ پشیلەتان دیوە، وا نییە؟ باشە چی دەخوات؟

– گۆشت، شیر، ماسی ئەگەر ئەمانەشی دەست نەکەوت ئەوا نان دەخوات، هەر فرسەتێکی بۆ ڕێکەوت دەچێت بۆ گیانی مشك و دەیخوات.

– ئەی دەزانن سەگ چی دەخوات؟

– له چەشنی گۆشت و ئێسقان و ماسی هەرچییەکی بێتە بەردەم ڕەتی ناکاتەوە، ئەمانەشی دەست نەکەوت بە هەموو شتێك ڕازییە.

– ئەی مەڕ و بزن و مانگا و ئەسپ و گوێدرێژ، ئەمانە چۆن سکی خۆیان تێر دەکەن؟

– بەگژوگیا سکی خۆیان تێر دەکەن. هەمووشیان چاو لەدەستی مرۆڤن، چونکە خزمەتی مرۆڤ دەکەن.

– ئەم ئاژەڵانە بەردەوام لەبەرچاومانن، دەیانناسین و، لەگەڵیان ڕاهاتووین... ئەی ملیارەها ئاژەڵی دیکە، هەزارەها جۆر مێش و مەگەزی لە ژمارە نەهاتوو، باڵندە و هەموو گیاندارەکانی ناو دەریاکان..

ئەو ئاژەڵانەی لە بیاباندا دەژین و، ئەوانەی دارستان لانەیانە، ئەوانەی بە ئاسماندا دەفڕن و ئەوانەشی ژیانیان لەژێر خاکدا بەسەر دەبەن، هەموو ئەمانە چی دەخۆن؟ چی دەخۆنەوە؟ کەی دەیخۆن؟ چۆن دەیخۆن؟

خۆ ئەمە ڕۆژێك نییە و دوان نییە، باشە تا کۆتایی تەمەنیان خواردنی ڕۆژانەیان لەکوێ پەیدا دەکەن؟ چۆنی پەیدا دەکەن؟

نەدەزانن وەك مرۆڤ دانەوێڵە و شت هەڵ بگرن، یا کۆیبکەنەوە، چونکە وەك ئێمە خەم بە ڕابردوو و داهاتوویانەوە هەڵناگرن.

خواردنی هەر ئاژەڵێك جیاوازە لەوی تر، خواردنەوەیان جیاوازە، هیچ کامیان خواردنی ئەوی دیکەیان ناخوات.

دەبینیت ئاژەڵێك حەزی لە جۆرە خۆراکێکە، کەچی ئاژەڵێکی تر هەر ئاوڕیش لەو جۆرە خۆراکە ناداتەوە.

باوەشێك گیای تازە بخەرە بەردەم پەپوولەیەك، هەر بەلاشیا ناچێت، یان پارچەیەك گۆشتی ناسك بخەرە بەردەم وشترێك دەمیشی تێوە نادات.

هەندێك جۆر لە ئاژەڵەکان کەم دەخۆن و، هەندێکی دیکەشیان بەهیچ تێر ناخۆن.

مێروویەکی وەك هەنگ بە کەمێك هەڵاڵە تێردەبێت و، کەچی جۆرە ئاژەڵی وا هەیە کە نازانن تێربوون چیە.

باوەشێ گیا بەشی بزنێك دەکات، بەڵام خەرمانێك یا بارێك گیا بۆ تێربوونی فیل هێندەی مشتێکە، مشتێ گەنم بۆ چۆلەکەیەك زۆرە، بەڵام داڵێك دەبێت زۆر بخوات بۆ ئەوەی گەدەی تێر بکات.

سەرەمێکوتەیەك بە ئەندازەی سەرە نینۆکێك شت دەخوات، بەڵام نەهەنگێك بە تەن ماسی دەخوات.

جا خۆ ئەم ئاژەڵانە هەر خۆشیان نین، بەڵکو بەچکەشیان هەیە، واتە مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت ژمارەی ئەم هەموو ئاژەڵە چەندە.



بەچكەی ئاژەڵە شیردەرەكان بە شیری دایكیان تێر دەخوات، بەچكەی ئاژەڵی ناشیردەریش بەو خواردنانە تێر دەبێت كە دایك و باوكی بۆی دێننەوە.

مەڕو بزن و ئەو ئاژەڵانەش کە هاوشێوەیانن، کاتێك خۆراك دەخۆن هەم خۆیان تێردەکەن، هەم لە پاشاندا گۆشت و شیرەکەشیان دەبێتە خۆراك بۆ ئێمە.



کاتی ژەمە خواردنی هەر ئاژەڵێك لە یەکێکی تر جیاوازە.. هەیانە یەك ژەم دەخوات، هەیانە سێ چوار ژەم دەخوات، هەیانە هەر زوو زوو کەمێك دەخوات، هەشیانە بەردەوام خەریکی خواردنە، هەروەك کارگەیەك کە بەردەوام لە کاردا بێت.

هەیانە گەر ڕۆژێك نان نەخوات ژیانی تەواو دەبێت، هەشیانە دەتوانێت چەندین مانگ بێ خواردن و خوادنەوە زیندوو بمێنێتەوە.

ئەوەتا جۆری ئاژەڵی وا هەیە کە تەواوی هاوین دەخۆن و دەخۆنەوە، بەڵام لەگەڵ زستانیان بەسەردا هات و بەفر دەستی بە بارین کرد، یەك وەرزی تەواو بێ خواردن لە هێلانە و لەژێر زەویدا دەمێننەوە.

هەندێك جۆر ئاژەڵی زۆر وردیلە هەیە کە تەنها بۆ چەند کاتژمێرێك یان بۆ چەند ڕۆژێك دەژین و، هەر ئەوەندەش پێویستیان بە ڕۆژی هەیە، بەڵام جۆرە ئاژەڵێکی وەك کیسەڵ کە زیاتر لە سەد ساڵ دەژی، بەردەوام پێویستی بە خۆراك هەیە.

ئەم هەموو ئاژەڵە لە ژمارە نەهاتووە، کە تا ئێستاش هەندێکیان نەناسراون، چۆن پێویستی خۆیان دابین دەکەن، چۆن کاتەکانی خۆیان ڕێك دەخەن؟

کەواتە پێویستە یەکێك هەبێت کە هەموو شتێك بزانێت و هەموو شتێك ببینێت، بێ لەبیرکردن و لێتێکچوون ڕۆزی هەموو ئەم ئاژەڵانە بدات و پێویستییەکانیان دابین بکات، برسێتی و تینوویەتییان نەهێڵێت، هەروەها بە یاسا و ڕێسایەکی ڕێکوپێك کارەکانی بەڕێوەبەرێت.

گریمان، ئەگەر خودا تەنها بۆ یەك ڕۆژ ئەرکی پەیداکردنی خواردنی باڵندەکانی لەسەرشانی ئێمەی مرۆڤ دابنایە، چی دەبوو؟ دەبووە وێرانە، کەس نەیدەتوانی ئەم ئەرکە بەجێ بهێنێت، باڵندەکانیش لەبرسا دەمردن و لەناو دەچوون.

ئەو زاتە ڕۆزیدەر (الرزاق)ە: بۆیە هەموو بوونەوەرێك ڕزقی خۆی لەو داوا دەکات. بێگومان خوای گەورەش هەر لەسەرەتای بەدیهێنانی دونیاوە ڕزقی هیچ بوونەوەرێکی فەرامۆش نەکردووە، هەرواش بەردەوام دەبێت، چونکە ئەو تاکە بەدیهێنەر و خاوەن موڵك و دەستەڵاتە.

ئـــەو بەخشـــندە (الكـــريم)ە: خـــواردن و خواردنـــەوەی هـــەموو بوونـــەوەرێك بـــێ برانـــەوە دەبەخشـــێت، چـــونكە ئـــەو بەخشـــەری ڕاستەقینەیە.

ئـــەو میهرەبـــان (الـــرحیم)ە: هـــەموو گیانلەبـــەرێك پێویســـتی بـــە ڕەحمەتی ئەو هەیـە، هـەر بۆیـە ڕەحمـەتی نـەبڕاوەی پـەروەردگاریش هەموان دەگرێتەوە، ئەوەتا ئەو زاتە بێچووی هەموو ئاژەڵێك بەوپەڕی بەزەیی و سۆزەوە دەپارێزێت.

ئەو دانا (الحكيم)ە: هەر جۆرە ئاژەڵێك حەزی لە چ جۆرە خۆراكێك بێـت خـوای گـەورە ئـەوەی پـێ دەدات، هـەروەها بـە دانـایی خـۆی پێداویستی هـەموو زینـدەوەران دابـین دەكـات، جەستەیان پێویسـتی بەچی بێت ئەوەیان پێدەبەخشێت.[1]

---

١- لە (مەكتووبی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# چۆن لە سوپاسگوزاریی (شکر) تێ بگەین؟



با پارچەیەك كاغەزی گەورە لەسەر مێزێك دابنێین، پاشان چوار بازنەی لەناویەكدای لەسەر بكێشین.

یەكەم بازنە با زۆر گەورە بێت، بەمە دەڵێین بازنەی گەردوون، واتە بازنەیەك كە هەموو ئەو شتانەی بیستومانە و بینیومانە و دەیزانین و نایزانین لەخۆدەگرێت.. با لەناو ئەم بازنەیەدا (ژیان) دابنێین.

– بۆچی ژیان دابنێین؟

– چونكە گەر ژیان نەبێت، هیچ شتێك بوونی نابێت، هەموو شتێك پەیوەستە بە ژیانەوە، وەرن ژیان لە گەردوون جیابكەینەوە، دەبینیت تەنها تۆپەڵێك ماددەی كەڵەكەبوو دەمێنێتەوە.

هەموو بوونەوەرێك پەیوەستە بە ژیانەوە، خزمەتی ژیان دەكات، ئەو شتانە بەرهەم دێنێت كە بۆ ژیان پێویستن.



ئەستێرەکان، خۆرەکان، چیاکان، ڕووبارەکان، دەریاکـان، ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ، هەموویان لەپێناو زیندوومانەوەدا کاردەکەن، خـودای مـەزن گـەردوونی بـەدیهێناوە و (ژیـان)ی تێـدا خولقانـدووە، تەنانـەت یەکێك لەناوە پیرۆزەکانیشی (الحي)ە، لەبەر ئەوەی خـاوەنی ژیانـە و، ژیانی بەدیهێناوە و، ژیانی داوە بە بوونەوەرانی.

دووەم بازنـــە؛ بازنـــەی زیندەوەرانـــە، کـــە مـــرۆڤ چـــەقەکەی پێـــك دەهێنێت.

بازنەی زیندەوەران خۆی بۆ خۆی بازنەیەکی فراوانـە، ڕووەکـەکان و، ئاژەڵەکان و، فریشتە و جنۆکەکانی تێدایـە. ڕاسـتە ئێمـە فریشـتە و جنۆکە نابینین بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئیتر بوونیان نییە، بەڵکو ئەوانیش لە بازنەی زیندەوەراندان.

مرۆڤ لە ناوەڕاستی ئەم بازنە فراوانەدا خـۆی دەبینێتـەوە، چـونکە هەموو زیندەوەران لەبەر مرۆڤ کـار دەکـەن و، خزمـەتی مـرۆڤ دەکـەن، واتە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ بەدیهێنراون.

خوای گەورە لەنێوان زیندەوەراندا مرۆڤی وەك بەنـدە و گوێڕایـەڵی خۆی هەڵبژاردووە و، چەند فەرمان و داخوازییەکیشی بەسەردا داوە.

بەکورتی؛ مرۆڤ وەك بەدیهێنراوێك پلەی لە هەموو بەدیهێنراوەکانی دیکە بەرزترە... چونکە هـەموو شـتێك لـە دەوری مـرۆڤ دەسـوڕێتەوە، واتە گەردوون بۆ ئێمە دەسوڕێت.

بازنەی سێیەم؛ بازنەی (مرۆڤ)ە، کە ڕنق و ڕۆزی خاڵی ناوەڕاسـتی ئەم بازنەیە پێك دەهێنێت. جیهانی مرۆڤایەتی بازنەیەکی زۆر گـەورە و فراوانە و، هەموو مرۆڤەکانی دونیای لەخۆ گرتووە.

ئەفریقی، ئاسیایی، ئەمریکی، ئەورووپی، مرۆڤی هـەموو وڵاتـەکان، بە ڕەش پێسـت و سـپی پێسـت و جۆرەکـانی تریشـیەوە، بـە یابـانی و

چینییەوە.. خوای گەورە لە ناوەڕاستی ئەم بازنەیەدا ڕزقی بۆ هەموو ئەم جۆر و شێوە و ڕەگەز و نەتەوانە داناوە. ڕزق: خواردن و خواردنەوە و هەموو ئەو پێداویستییانە دەگرێتەوە کە ئەم مرۆڤانە بەکاریان دەهێنین.

ئەگەر تەنها خواردن و خواردنەوەکان لەبەرچاو بگرین، ئەوا بە ملیۆنان و ملیاران جۆر خواردن و خواردنەوەمان هەیە.



هەموو زیندەوەران بەدوای خواردنەوەن، واتە بە مرۆڤ و ئاژەڵ و هەموو زیندەوەرەکانی دیکەشەوە لە هەوڵی پەیداکردنی بژێوی

خۆیاندان و، بۆ ئەمەش بەردەوام هەوڵ دەدەن و، کاردەکەن و، ڕەنج دەدەن.

لە ڕاستیدا خوای گەورە مرۆڤ و هەموو زیندەوەرانی دیکەشی کردووەتە شەیدای ڕزق و ڕۆزی، لەڕوویەکی دیکەشەوە هەموو شەڕ و ئاژاوەکان لەسەر ڕزق دەکرێن، خۆ ئەگەر تەنها یەك شت هەبێت کە مرۆڤ ئالوودە بێت پێیەوە و بێ ئەوە ژیانی بەردەوام نەبێت، ئەوە (ڕزق)ە.

ئەم بازنەی سێیەمە هێندەی ئەم دونیایەمان فراوانە و، هەموو زیندەوەرانی تێدا دەژی.

بازنەی چوارەم؛ بازنەی (ڕزق)ە، کە بەدەوری سوپاسگوزاریدا دەخولێتەوە. خوای گەورەش هەموو شتێکی لە دەوری ڕزق و ڕۆزی کۆکردووەتەوە، هەموو جۆرەکانی ڕزقیش بەهۆی شوکرانەبژێریی و سوپاسگوزاربوونەوە لەمەیداندا ماوە، واتە ڕزق بەهۆی شوکرەوە بوونی ماوە.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و هەشتەم)ەوە وەرگیراوە.

# چەند جۆر سوپاسگوزاریی هەیە؟



حـــەز و ئارەزووەمـــان بـــۆ ڕزق و ڕۆزی خـــۆی لـــە خۆیـــدا جـــۆرە سوپاسێکە.

برسێتی و، تینوێتی و سەرمابوونیشمان هۆکاری سوپاسگوزارین.

تەنانەت ئەو تاموچێژەی لە خـواردن و خواردنـەوەکان دەیبیـنین سوپاسـگوزارییە.. بەشـێوەیەکی گشـتی هـەموو گیانلەبـەرێك بـەم جۆرانەی سەرەوە سوپاسگوزار دەبێت.

بـەڵام سوپاسـگوزاریی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە کـە لـەڕێی زانسـت و تێگەیشتن و هۆشەوە بێت.

– کەواتە سوپاسگوزاریی هۆشمەندانە چۆن دەبێت؟ یـا پێویسـتە چۆن بکرێت؟

### - شێوازی بنەڕەتی و یەکەمی سوپاسگوزاریی لەڕێی:

ناسین و ئاشنابوونە بە زاتی پەروەردگاری ڕۆزیدەر، واتە تەواو دڵنیا بیت کە تەنها خوای تاك و تەنها هەموو نیعمەتەکانی پێ بەخشیویت.

هەروەها دانانە بەوەدا کە ئەو زاتە هەموو شتێکمان پێ دەبەخشێت و، لەبنەڕەتیشەوە بەشێوەیەك بەدییان دەهێنێت کە سوودی بۆ ئێمە هەبێت.

لە تۆوە هەنجیرێکی بچووکەوە ئەو دارە پەلدار و گەورەیە پێك دەهێنێت، کاتێکیش وەرزی خۆی هات ئەو هەنجیرە شیرین و خۆش و بەلەزەتەی لێوە بەرهەم دەهێنێت.

لەپێناو پێگەیاندنی ئەو هەنجیرە بەتامەشدا، باران دەبارێنێت تا ئاوی بدات، خۆر دەکاتە سەرچاوەی ڕووناکی بۆی تا پێی بگەیەنێت، با دەکاتە ڕێکخەر و هۆکاری گواستنەوەی تۆوەکانی، لە نێوەندەشدا ئێمەش تەنها خواردن و سوپاسکردنمان بۆ دەمێنێتەوە.

جوانیی و ڕازاوەییەك لە بەخشینی نیعمەتەکاندا هەیە، واتە بەشێوەیەکی زۆر پرسۆز و ناسك ڕۆزیمان پێ بەخشراوە.

با بیر لە پێگەیشتنی (قۆخ)ێك بکەینەوە:



لەگەڵ هاتنی بەهاردا درەختی قۆخ بە گوڵە ناسك و پەمەییەكانی ڕەنگی پەمەیی دادێت، زۆر نابات بە گەڵای سەوز خۆی دادەپۆشێت، دوای چەند هەفتەیەك قۆخێكی كاڵ و تاڵ دەگرێت، پاش تێپەڕبوونی چەند هەفتەیەكی دیكە ڕەنگی قۆخەكە بۆ سەوز یاخود زەرد دەگۆڕێت، پاش ئەوە بە ماوەیەكی كەم لەسەر ڕۆپی لقەكانەوە قۆخێكی ئاوداری جوان ئاو لە دەممان دێنێت.

ئای! ئەو قۆخە بەلەزەتە چەند دیمەنێکی جوانی هەیە، تخوا وا نییە؟

ئیتر ئەمەش بانگهێشتنامەیەکی پەروەردگارمانە بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بین...

## دووەم شێوازی سوپاسگوزاریی: لەڕێی ڕێزگرتن و بە گەورەزانینی نیعمەتەکانەوە دەبێت

تەنها خوای گەورە خۆی هەموو نیعمەتەکانمان پێ دەبەخشێت و، هەرچیش لەو زاتەوە بێت ڕێزدار و بەنرخە، ئەوەتا بەو نیعمەتانە پێداویستییەکانمان دابین دەکەین و، برسێتیمان دەڕوات، تینوێتیمان دەشکێت و، بەردەوامیی بە ژیان دەدەین، هەر بۆیە پێویستە نیعمەتەکانمان لا بەنرخ و ڕێزدار بن و، بە بچووك و بێ بەهایان نەگرین و سوکایەتییان پێ نەکەین.

بۆ نموونە: ڕێز و حورمەتگرتن لە پارچە نانێکی ڕەق بە سوپاسگوزاریی هەژمار دەکرێت.

ئەم تێگەیشتنەش شێوازێکی گرنگی سوپاسگوزارییە.

## شێوازی سێیەمی سوپاسگوزاریی: لەملاولا بەفیڕۆنەدانی نیعمەتەکان

تەواونەکردنی ئەو خواردنەی کردووتە قاپی نانخواردنەکەتەوە و، فڕێدانی جووتێک پێڵاوی ساغ و نیوەتازەت پاش ماوەیەك لە لەپێکردنیان، نەگرتنەوەی بەلۆعەی ئاو لەکاتی ئاوبەکارهێناندا و، بە داگیرساوی جێهێشتنی گڵۆپی ژوورێك کە کەسی تێدا نەبێت، بەڵام لە هەمووی گرنگتر: بەفیڕۆدانی کاتەکانی تەمەنمان و، خەرجکردنی پارەو سامانمانە لە شتی پڕوپووچدا؛ هەموو ئەمانە نموونەی زیادەڕۆیین، تەنانەت نیشانەی ناسوپاسگوزاریشن.

بە ڕێکوپێکی و بێ زیادەڕۆیی بەکارهێنانی نیعمەتەکان لە کات و شوێنی خۆیاندا خۆی لە خۆیدا سوپاسگوزارییە.

کاتێك لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەرەنگاری زیادەڕۆیی دەبینەوە و دژایەتیی دەکەین، ئارامیی و ئاسوودەییمان دەست دەکەوێت.

## چوارەم شێوازی سوپاسگوزاری: بەقەناعەت بوونە بەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین

پێویستە لە ئاست نیعمەتەکاندا چاوتێر و بە قەناعەت بین، چونکە قەناعەت گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووە و، هەر کەسێك بە بەشی خۆی

ڕازی بێت ئەوا ئاسوودە و بەختەوەر دەبێت، چونکە بە ئیرادە و ویستی پەروەردگار ڕازی دەبێت.

چاوبرسێتیی و تەماعکاریی و وتنی: من بۆ ئەمەم نییە و، بۆ فلان هەیەتی؟.. هەروەها دەستپانکردنەوە لە کەسانی تر و، قورپێوان بۆ دونیا و، بڕوانەبوون بەوەی کە ڕزق و ڕۆزیت بەشت دەکات و، ڕژدیی و دەست نوقاندن و ڕەزیلیی و، چاو لەدەستی خەڵکی بوون ..هتد، هەموویان کۆمەڵێك ڕەفتاری هەڵەن و دوورن لە سوپاسگوزارییەوە.

بۆ نموونە:

ڕەنگە خۆراکی ڕۆژانەی مێرووولەیەك لە دەنکە گەنمێك یان دەنکە جۆیەك زیاتر نەبێت، بەڵام ئەگەر بۆی دەست بدات هەزارەها دەنك کۆدەکاتەوە، لەبەرئەمەشە زوو زوو گیانەوەرانی تر یا مرۆڤ بێ مەبەست و بە بێ ئاگایی پێی پێدا دەنێن! بەڵام هەنگ وا نییە، تەنها بەشی پێویستیی خۆی کۆدەکاتەوە و، زۆرینەی بەرهەمەکەشی پێشکەشی مرۆڤ دەکات، هەر بۆیە مرۆڤ شانە و لانەی بۆ ساز دەکات.

کەواتە هەر مرۆڤێك بۆ ئەوەی هەمیشە دەستی لەسەروو دەستەکانەوە بێت و دەست لە کەس پان نەکاتەوە بۆ یارمەتی و، هەروەها سەربەرز بێت، پێویستە وەك هەنگ قەناعەتی لەسەر ئەو ڕزقە هەبێت کە خوا پێی بەخشیوە، چونکە بەم شێوەیە دەبێتە بەندەیەکی خۆشەویستی خودا.

## پێنجەم شێوازی سوپاسگوزاری: بە خۆلادانە لە حەرام

پێویستە دووربین لەو شتانەی کە پەروەردگار خواردن یان خواردنەوە یان بەکارهێنانیانی قەدەغە کردووە و، هەردەم حەلاڵ هەڵبژێرین، واتە لەو نیعمەتانە سوودمەند بین کە خودا ڕێگەی داوین سوودمەند بین لێیان، گوێ نەدان بە حەرام و حەلاڵیی ماڵ و سامان و، نەناسین یا نەزانینی حەرام و حەلاڵ گەورەترین ناسوپاسگوزارییە.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و هەشتەم)ەوە وەرگیراوە.

## مافی سکاڵاکردنمان هەیە؟!



نموونەیەک:

بە کەسێکیان وت ئەمە منارەیەکی حەفتا پلیکانەییە و، گەر بەم حەفتا پلیکانەیەدا سەر بکەویت دەگەیتە لووتکەی منارەکە.. لەسەر هەر پلیکانەیەکیش پارچە زێڕێکت بۆ دانراوە...

واتە ئەو کەسە بە هەر هەنگاوێك و سەرکەوتن بەسەر هەر قادرمەیەکدا پارچە زێڕێکی دەست دەکەوت.. پاش ماوەیەك هەموو پلیکانەکانی بڕی و گەیشتە لووتکەی منارەکە، واتە ئێستا هەم حەفتا پارچە زێڕی پێیە و هەم لەسەر شوێنێکی بەرزیشە.



لەو کاتەدا ئەو کەسە تەماشایەکی دەوروبەری خۆی و کرد و چاوی
بە چەند منارەیەکی بەرزتر کەوت، ئاهێکی هەڵکێشا و وتی: باشە
بۆچی بەم منارەیەدا سەرکەوتم؟ بۆچی بەسەر منارە سەد

پلیکانەییەکە سەرنەکەوتم، ئەوە بەرزتر بوو و، زێڕی زیاتریشی لەسەر بوو.

واتە ئەو کەسە جێگەی خۆی بەدڵ نەبوو و، بە حەفتا پارچە ئاڵتونەکەش ڕازی نەبوو!

هەر بۆیە پێیان وت:

بە بەشی خۆت ڕازی بە، خۆ کەسی زۆر هەیە کە تەنانەت هێندەی تۆشی چنگ نەکەوتووە، کەواتە پێویستە بۆ حاڵی خۆت سوپاسگوزار بیت و، سکاڵا دەرنەبڕیت و، بۆڵە بۆڵ نەکەیت؛ چونکە یەکێك هەیە کە تۆی هێناوەتە ئەم شوێنە و ئەم هەموو زێڕەشی پێداویت، کەواتە باشتر وایە لەپێشدا سوپاسی ئەو زاتە بکەیت، دواتریش بە بەشی خۆت ڕازی بیت.

دەتوانین بڵێین ئێمەی موسوڵمانیش لەسەر منارەیەکی وا وەستاوین و، لەگەڵ هەر هەنگاوێکماندا خوای گەورە بە سەدان نیعمەتی وەك زێڕ و گەوهەرمان پێ دەبەخشێت.

دەگونجا ئێستا لە دونیادا نەبووینایە، بەڵام هەین و بەدیهێنراوین، واتە لە نەبوونەوە هێنراوینەتە بوون و، تامی نیعمەتی ژیان دەکەین، ئەوەتا وەك مرۆڤ لەژیانداین و، زیندووین... نەبووینە خاك و دار و بەرد ... واتە بوونەوەرێکی بێ گیان و عەقڵ نین، بەڵکو ڕۆحمان هەیە،

لەکاتێکدا دەکرا دارێك، ڕووەکێك، گەڵایەك بووینایە... بەڵام ئەوەتا گیانلەبەرین، دەشکرا لەناو گیانلەبەراندا ئاژەڵێك یا مێروولەیەك یان مێشێك بووینایە، بەڵام سوپاس بۆ خودا نەبووین بەوانە... بەڵکو لەناو ئەم هەموو بوونەوەرەدا بووین بە (مرۆڤ) و، وەك مرۆڤێك بەدیهێنراین و، تام و چێژی مرۆڤبوون دەچێژین، سوپاس بۆ خوا کە مرۆڤین..

لەسەروو ئەوەشەوە نیعمەتێکی دیکەمان پێدراوە کە هێندەی نیعمەتی مرۆڤایەتی مەزنە، ئەویش ئەوەیە کە بە موسوڵمانی دەژین.

بەدیهێنەری خۆمان ناسی و، بڕوامان پێ هێنا، بووینە بەندە و ملکەچی فەرمانەکانی، خۆشمان ویست و بڕیارمان دا تا مردن خۆشمان بوێت، لە گێژاوی گومڕایی و سەرلێشێواویدا نەماینەوە و بووین بە مرۆڤێکی بڕوادار و، تەندروست و لەشساغ و، ژیر و دانا... لە ڕاستیدا سەدان و هەزاران و ملیۆنان و ژمارەیەك نیعمەتی کۆتانەهاتووی دیکەشمان پێ بەخشراوە..

ئێمە لەبەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتەدا تەنها وشەیەك کە لە زارمان دەردەچێت: (سوپاس)ە، واتە سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم کە هەموو شتێکت بە من بەخشیوە.. بەڵام لە چاو ئەو هەموو نیعمەتەشدا هێشتا زۆر کەم سوپاسگوزار دەبین!

ڕەنگە تەنها ئێمەی مرۆڤ لە حاڵ و گوزەران و ژیانی خۆمان ڕازی نەبین و زوو زوو سکاڵا دەربـبڕین، لەبەرامبەردا هەموو بوونەوەرانی دیکە هەمیشە سوپاسگوزار بن.

ئەوەتا کانزاکان، لە بارودۆخی خۆیان ڕازین و، هەرگیز ناڵێن: بۆچی ڕووەکێک نەبووین؟ ڕەنگە ئەوان لەبەرئەوەی خوا وەك کانزا بەدییهێناون هەمیشە سوپاسگوزاری بن، بەڵام بێگومان بە شێوازێکی تایبەت بە خۆیان.

ڕووەکەکانیش لە حاڵی خۆیان ڕازین و سوپاسگوزارن، لە سکاڵاکردن و ئاه و خۆزگەی بوون بە ئاژەڵ بەدوورن، لەبەر بوون و ژیانیان سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن.

ئاژەڵەکانیش بەو جۆرەن، ئەوەتا بەو حاڵەی خۆشیانەوە هەرگیز داوای بوون بە مرۆڤ ناکەن، چونکە ئەوانە ڕۆحیان هەیە و دەژین، لەبەر ئەوە ئەگەر کارێك هەبێت کە بیکەن ئەوا تەنها سوپاسکردنی خودایە.

تاکە هۆکارێك بۆ داباڕین و نەبڕانەوەی نیعمەتەکان، سوپاسکردنی بەخشەرەکەی و، هەست کردنە بەوەی کە هەر ئەو زاتی بەخشەرە و هەموو نیعمەتەکانمان پـێ دەدات، هەروەها ڕازیبوونە بەوەی پێمان دەبەخشێت و هەوڵدانە بۆ ڕازیکردنی ئەو زاتە لە خۆمان.

سەرەڕای ئەوەی پێویستە هەمیشە ئەوەندە ئەو زاتەمان زۆر خۆش بوێت، کە دڵنیا بین لە دوارۆژدا شایستەی ئەوەین بە دیداری موبارەکی شاد بین.

واتە مافی سکاڵا و کڕوزانەوە و لاڵانەوەمان نییە، چونکە ئێمە خۆمان نەمانزانیوە چ نیعمەتێکمان پێویستە و، هیچ شتێکمان لە بەرامبەر نیعمەتەکانی خودادا نەداوە، نە پارە نە سامان...

لە بەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتە نەبڕاوەیەدا خودا تەنها داوای سوپاس و خۆشویستن و گوێڕایەڵی و بەندایەتی دەکات، بۆ هاتنەکایەی هەموو ئەمەش پێویستە زاتی موبارەکی بناسین...

گەر بەم شێوەیە سوپاسگوزار بووین، ئەوا خوای گەورە بەڵێنی داوە سەرەڕای نیعمەتەکانیش بە بەهەشتی بەرین شادمان بکات.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و هەشتەم)ەوە وەرگیراوە.

# بۆچی پێویستە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرین؟



پەروەردگاری مەزن دونیای کردووەتە سفرە و خوانێکی ڕازاوە و، هەموو جۆرە نیعمەتێکی لەسەر داناوە، کە نە لە ژمارە دێن و نە کۆتاییان دێت، وەك سەدەها جۆر سەوزە و هەزارەها جۆر خواردنیش کە لەم سەوزانەوە دروست دەکرێن.

سەدەها جۆر میوەی وەك سێو و ترێ و مۆز و هەرمێ و هەڵوژە و قۆخ و شووتی و کاڵەك.. واتە ئەو هەموو میوە جوان و بەتامەی بە لق و پۆپی درەختەکانەوەن و پێشکەشمان دەکرێن.

هەروەها گەنم و جۆ و برنج و جۆرەها دانەوێڵەی بەسوود ...

ئەی دیمەنی نان و کولێرەی برژاوی ئێواران بۆ ناڵێی کە خەڵکی بە ڕیز وەستاون بۆ کڕینی...



جا شیرینی و پاقلاوە و خورمای بەلەزەت لەولاوە بوەستێت،
هەموو ئەمانەش لە مانگی ڕەمەزاندا...

ئێمەی ڕۆژووانان خودای گەورە چەندێك ڕزقی پێ ڕەوا بینیبین
سفرەکانمانی پێ دەڕازێنینەوە.. کە بۆن و بەرامەی خۆش و، هەستی

ئاسوودەیی ناخمان و، تینوویێتی و برسێتیمان ڕامان دەکێشێت بۆ لای سفرەکە.

هەموو ئەندامانی خێزان پێکەوە لەگەڵ هاوڕێیان، خۆشەویستان، لە دەوری سفرەکە دادەنیشین. هەر ئێمەش نا، بەڵکو هەموو ڕۆژووگرانی دونیا، هەموو بڕواداران لە دەوری سفرە چاوەڕوانی بەربانگن.

– چاوەڕوانی چی دەکەن؟

– فەرمانی: (فەرموون ڕۆژووەکانتان بشکێنن، بەربانگ بکەنەوە)...

– ئەوە فەرمانی کێیە؟

– فەرمانی بەخشەری هەموو ئەم نیعمەتانەیە، ئەو خوایەی کە بە سۆز و بەزەییە بۆمان.

– ئەو خوایە تەنها خواردن و خواردنەوەمان پێ دەبەخشێت؟

– بێگومان نەخێر، ئەو خوا میهرەبانە گەدەی پێداوین، دەم و زمان و ددانی پێداوین، لەگەڵ ئەمانەشدا چێژێکی تایبەتیمان لە هەر نیعمەتێکدا پێ دەبەخشێت، خانەی تامکردنی هەموو تامەکانی لەسەر زمانمان و لەناو مەلاشوماندا جێگیر کردووە.. عەقڵ و ژیریشی پێ بەخشیوین کە درک بە بەخشەری ئەم هەموو نیعمەتە دەکات و، دڵیشی پێ داوین تا بڕوا بەو بەدیهێنەرە بهێنێت.

هەموو ڕۆژووگران پێکەوە فەرمانی بەدیهێنەرێکی تاك و تەنها بەجێ دەهێنن، وەك ئەوەی هەموویان سەربازی لەشکرێك بن، واتە هەموو موسوڵمانانی دونیا نموونەی کۆمەڵە سەربازێکن کە فەرمانی یەك فەرماندە بەجێ بهێنن.

هەموومان بە فەرمانی سوڵتانی ئەزەلی و ئەبەدی بە خۆشی و پەرۆشییەکی زۆرەوە کاردەکەین و، بە بەندایەتی و پەرستشمان وەڵامی ئەم هەموو نیعمەت و بەخشندەیی و بەرەکەتەی خوای گەورە دەدەینەوە، واتە بە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، بە خۆڕاگری و دان بەخۆداگرتنمان لە پارشێوەوە تا بەربانگ و ڕۆژووشکاندنمان.

بە جۆش و خرۆش و پەرۆشییەوە بەڕۆژوو دەبین و، پێنج نوێژە فەرزەکە و شەونوێژی تەراویحیش دەکەین.

خۆر هەموو ڕۆژێك لە هەمان شوێنەوە فەرمان وەردەگرێت و، بەشەوقەوە هەڵدێت.

مانگیش هەر بە هەمان شێوە لە تاریکایی شەودا بە زەردەخەنەوە وەك چرایەك ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە.

باران لە هەمان سەرچاوەوە فەرمان وەردەگرێت و، دونیا پڕ بەرەکەت و ئاوەدانی دەکات، یاخود دەبێتە لافاو و هەموو شتێك لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێت.

گوڵـه بـەیبون و وەنەوشــە و یاســەمین و مێخـەکیش لـە هــەمان سەرچاوەوە فەرمان وەردەگرن و، ڕەنگـاوڕەنگ خۆیـان دەنـوێنن و، بۆن و بەرامەی خۆشی وەك میسك بڵاودەكەنەوە.

ئێمەش وەك هەڵهاتنی خۆر و درەوشانەوەی مانگ و بارینی باران و پشــكوتنی خونچــەی گوڵــەكان... فــەرمان وەردەگـرین و، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەگرین.

– بۆچـی پـێش ئـەوەی بـانگی ئێـوارە بفـەرموویت دەسـت بـۆ خواردنەكان نابەین و، تەنانەت یەك قوم ئاویش ناخۆینەوە؟

– چونكە لە ڕاستیدا ئـەو نیعمەتانـە هـی ئێمـە نـین، ئەگـەر هـی خۆمان بوونایە هەركات حەزمان لێیان بووایە دەمانخواردن و كەسیش بۆی نەبوو نەیەڵێت بیانخۆین.. بەڵام ئەگەر بۆ نـانخواردن چـاوەڕوانی فەرمان بین، كەواتە ئەو خواردن و خواردنەوانە هی خۆمان نین و، هەر ئەو زاتەی ئیزنمان دەدات بیانخۆین خاوەنی ڕاستەقینەی هەموویانە.

## بەهۆی ڕۆژووەوە لە ئازاری برسێتی تێدەگەین:

لــە مانگــەكانی غــەیری ڕەمەزانــدا، كاتێــك لــە دەوری ســفرە دادەنیشین و، سەرەتا قاپێك شۆربامان بۆ دابنێن، دەڵێین:

– ئاه! ئەمە بیبەرتان زۆر تێکردووە، زۆر توونە.. من حەزم لەمەیان نییە، شۆربایەکی دیکەم بۆ بێنن.

پاش شۆرباخواردن، کاتێك جۆرە خواردنێکی ترت بۆ دێنن، دەڵێیت:

– دیسانەوە ساوەر، خۆ ئەمجارەش باش نەکوڵاوە! هیچی ترمان نییە بیخۆین؟

بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا، حەزمان لەو هەموو خواردنانەش دەبێت کە گلەیی و گازندەی زۆرمان لێیان هەبووە و، نە لە کوڵانی دەپرسین و، نە لە کەمرۆنیی و نە لە کەمخوێی...

جا ئەگەر بۆ ڕۆژووی ئەو ڕۆژە پارشێومان نەکردبێت و زۆریش هیلاك بووبێتین، ئەوا پارچە نانە ڕەقەیەکمان لا دەبێتە (کەباب).. بەڕاستی تەنها لە ڕەمەزاندا لە بەهای ئەو پارچە نانە تێدەگەین، واتە ئەو پارچە نانەی کە ڕۆژانی دیکە دەستیشمان بۆ نەدەبرد، ئێستا لەسەر سفرەی بەربانگ لە نرخی تێدەگەین و قەدری دەزانین..

لەکاتی بەربانگدا لە دەوڵەمەندترین کەسەوە تا هەژارترین کەسمان یەکسانین و، هەموومان پێکەوە سوپاسگوزاری دەردەبڕین و، پێکەوە هەست بە بەهای نیعمەتەکان دەکەین.

هەمووماں لەسەر ئەو بەئاگاهێنانەوەیەمان لەلایەن ڕەمەزانەوە سوپاسگوزارین و، بەخۆشحاڵیی و ئاسوودەییەوە سوپاسی پەروەردگارمان دەکەین.

## بەهۆی ڕۆژووەوە هەست بە خەم و نەداریی هەژاران دەکەین:

پێدەچێت لە گەڕەکەکەماندا خەڵکانی دەستکورت و هەژار هەبن، ڕەنگە تەنانەت لە دراوسێکانی ئەملاولاشماندا خێزانی وا نەدار هەبێت. ئەم بێکەس و هەژارانە تێیاندایە کە تەنانەت قاپێك شۆربای گەرمیان نییە، یا پارچە سەمونێك شك نابەن...

خۆ ئەگەر لە گەڕەکی خۆشماندا خێزانی هەژار نەبێت، ئەوا بێگومان لەجێگەی دیکەدا کەسانی وای لێیە و، بە ئاسانی دەستمان پێیان دەگات.

بەڵام کەسێك کە لە تەمەنیدا برسێتی نەچەشتووە و هەرگیز وەك خەیاڵێکیش بە بیریدا نەهاتووە، چۆن لە ئازاری برسێتی تێدەگات؟

تاکە ڕێگە بۆ تێگەیشتن لەم ئازارە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە، چونکە کە یەك مانگی تەواو بەڕۆژوو دەبیت و هەندێ ڕۆژ زۆرت برسی دەبێت، وەکو هەژاران بۆ پارچە نانێك دادەمێنیت.

پێشینانیش وتوویانە: (تێر ئاگای لە برسی نییە!).

لە مانگی ڕەمەزانیشدا تێرەکان برسی دەبن و ئازاری برسێتی دەچێژن، هەر بۆیە هەستی یارمەتیدانی هەژارانیان لەناخدا بۆ دروست دەبێت و، هەوڵی دابینکردنی پێداویستی و ڕەواندنەوەی برسێتییان دەدەن...

## لە ڕەمەزاندا قازانجمان یەك بە هەزارە:

ڕەمەزان مانگێکی پڕبەرەکەت و بەرهەمدارە، تەنانەت دەتوانین بڵێین بازرگانییەکی زۆر قازانجدارە... چونکە هەر جارێك پەرستشێك بکەین هەزار چاکەمان بۆ دەنووسرێت.

قەت لە دونیادا بازرگانییەکی وەك ئەمە بە قازانجتان دیوە؟ واتە سەد دینار بخەیتە کارەوە، کەچی لە ئەنجامدا سەد هەزار دینار قازانج بکەیت؟

خۆ ئەگەر ساڵێك بەسەر کارێکی بازرگانیدا تێبپەڕێت و خاوەنەکەی دوو هێندە قازانج بکات، ئەوا ئەو بازرگانییە زۆر بە سەرکەوتوو دادەنرێت.



بەڵام ئەو پەرستشانەی بۆ چاکەی دواڕۆژ دەکرێن زۆر لە بازرگانیی دونیایی جیاوازن و، زۆر بەرەکەتدارن و قازانجیشیان مسۆگەرە، ئەوەتا بۆ نموونە یەک ڕۆژ بەڕۆژووبوونی کەسێک لە مانگی ڕەمەزاندا، وەک گرتنی ڕۆژووی هەزار ڕۆژ وایە!

خوێندنی یەك لاپەڕە قورئانی پیرۆز لەو مانگەدا، وەك خوێندنی هەزار لاپەڕە وایە، خۆ ئەگەر خەتمی قورئانیش تەواو بکەیت ئەوا پشت بەخوا خێری هەزار جار خەتمکردنیت بۆ نووسراوە.

گەر یەك شەو نوێژی تەراویح بکەیت، ئەوا پەروەردگار خێری هەزار شەو تەراویحکردنت بۆ دەنووسێت.

لە شەو و ڕۆژی هەینیشدا ئەم خێرانە لە هەزار تێپەڕ دەکەن، جا ئەگەر گەیشتبیتە شەوانی قەدر ئەوا یەك چاکە بە سێ هەزار چاکە دەنووسرێت، چونکە شەوی قەدر لە هەزار مانگ خێری زیاترە.

تەنها خوای تاك و تەنها دەتوانێت ئەم نیعمەتانەمان پێ ببەخشێت و، هیچ کەس و هێزێکی دیکە ئەو دەستەڵاتەی نییە.

کەواتە ڕەمەزان، بازاڕ و پێشانگای دواڕۆژە و، بارانی بەهاری پڕ بەرەکەتە بەسەر پەرستشەکانماندا.

لە مانگی ڕەمەزاندا ڕۆژووانان وەك فریشتەکانیان لێدێت، چونکە فریشتەکان هیچ شتێك ناخۆن و ناخۆنەوە، ئێمەش ڕۆژانی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبین و هیچ شتێك ناخۆین و ناخۆینەوە.

شەوانیش شەونوێژ دەکەین و، قورئان دەخوێنین و، یادی پەروەردگار دەکەین و بەشداریی وانە و کۆڕی ئایینی دەکەین. پارشێو و بەربانگیشمان هەر لەبەر خودایە، کەواتە هەروەك فریشتەکان شەو و ڕۆژمان بە پەرستش و بەندایەتی دەبەینە سەر و،

گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا دەبین، نەك وەسوەسەکانی شەیتان، گوێ بۆ نیەتی پاکی دڵمان دەگرین، نەك نەفس و ئارەزوومان.

## چاو و گوێیەکانمان چۆن بەڕۆژوو دەبن؟

کاتێك باس لە ڕۆژوو دەکرێت یەکسەر بیرمان بۆ لای خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە دەچێت، وا نییە؟ واتە دوورکەوتنەوە لە خواردن و خواردنەوە.. بەڵام ئایا ڕۆژوو تەنها ئەمەیە؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر، ئێمەی مرۆڤ تەنها لە دەم و گەدە پێکنەهاتووین، بەڵکو ئەندام و هەستی دیکەشمان هەیە.

چاومان هەیە، گوێمان هەیە، دڵمان هەیە، زمانمان هەیە، عەقڵمان هەیە، خەیاڵ و بیرکردنەوەمان هەیە..

ڕزگاربوون و پاکبوونەوەی مرۆڤ لە هەستە خراپەکانی و بیرە هەڵەکانی زۆر گرنگە، هەر بۆیە تەنها بە دەم و گەدە بەڕۆژوو بوون بەس نییە، بەڵکو پێویستە چاو و، گوێ و، زمان و، دڵ و، عەقڵیشمان بەڕۆژوو بن.

- باشە هەستەکانمان چۆن بەڕۆژوو دەبن؟ واتە دەبێت خۆیان لە چی بپارێزن؟

## ڕۆژووی چاوەکانمان:

واتە گەر کچ بین یا کوڕ، پێویستە بەشێوەیەکی نەشیاو تەماشای ڕەگەزی بەرامبەرمان نەکەین و، لە ناخەوە هەستی خراپمان بەرامبەریان نەبێت، چاومان لە تەماشای بەرنامە و فیلم و زنجیرە درامای بێ کەڵك بپارێزین، هەروەها لەو دیمەنانەش کە کاریگەری خراپ لەسەر دەروونمان جێ دەهێڵن.

واتە چاوەکانمان لەجێی ئەمانە، بە شتی بەسوود و پەندئامێزەوە خەریك بکەین، بۆ نموونە قورئان بخوێنین، چاویلکەی سۆز و بەزەیی لەچاو بکەین، هەموانمان خۆش بووێت و بەچاوی سۆز و بەزەییەوە لێیان بڕوانین، بەم جۆرەش چاومان بەڕۆژوو دەبێت.

## ڕۆژووی گوێمان:

ئەمە کاتێك دەبێت کە گوێمان لە بیستنی قسەوباس و مۆسیقای ناشاز بپارێزین و، لەبری ئەمانە هەوڵ بدەین گوێ بۆ وتەی ڕاستی و، ئاوازی شیرین و دڵڕفێنی قورئانخوێندن بگرین، هەروەها گوێ بۆ ئاواز و مۆسیقای ئامانجدار و ئیمانی ڕابگرین تا دڵ و دەروونمان ئاسوودە بکات.

رۆژووی زمانمان:

زمانمان لە درۆکردن و، غەیبەت کردن و، قسە هێنان و بردن و، وتەی ناشیرین و ناڕەوا بپارێزین.. لەجێی ئەوانەش قورئان بخوێنین و، یادی پەروەردگار بکەینەوە و، سەڵاوات لەسەر پێغەمبەری نازدارمان بدەین و، لەسەر گوناهەکانمان تەوبە بکەین.



واتە گەر هەر گوناهێکت بەهۆی زمانەوە کردبێت هەر بەهۆی زمانیشەوە خۆتی لێ پاك بکەیتەوە، هەر کاتیش یەکێك قسەی ناشیرینی پێ وتیت، تەنانەت ئەگەر جنێویشی پێ دایت، ئەوا پێویستە ڕووبەڕووی نەبیتەوە و، بڵێیت: (من بەڕۆژووم) و، زوو زووش وەبیرخۆتی بهێنیتەوە کە پێویستە بەم شێوە دروستە عیبادەت بکەیت.

بەم جۆرە کەسی بەرامبەریشمان لە بێزارکردنمان پەشیمان دەبێتەوە و، خۆی داوای لێبوردن دەکات.

پێویستە بە دڵ و دەروون و بیر و خەیاڵیشمان بەڕۆژوو بین و، بیر لە شتی خراپ نەکەینەوە، ئەگەر شتێکی واش بە خەیاڵماندا هات هەوڵ بدەین لەبیری خۆمانی ببەینەوە و، دڵ و خەیاڵمان لە وەسوەسەکانی شەیتان بپارێزین.

بەم جۆرەش کاتێك هەموو ئەندام و هەستەکانمان پێکەوە بەڕۆژوو دەبن، ئەوا دەتوانین بڵێین ڕۆژوویەکی پوخت و ڕێکوپێکمان گرتووە و، إن شاء الله وەك پیاوچاکان و ئەولیاکان بەڕۆژوو بووین.

گەدە وەك کارگەیەکی گەورەیە لە جەستەماندا، هەر کات کارکردن و وەبەرهێنان لەوێدا وەستا، هەستەکانی دیکەشمان گوێڕایەڵی ئەو دەبن و، لە فەرمانەکانی تێ دەگەن.

بەو هیوایەی هەموومان بەردەوام هەوڵ بدەین ئەو ڕەفتارە جوانانە بکەینە خوو کە لە ڕەمەزاندا فێریان بووین و، ئەو وانانەی کە لە وەرزی خوێندنی ڕەمەزاندا فێریان بووین لە وەرزەکانی دیکەی تەمەنیشماندا بەکاریان بهێنین، بەم جۆرەش بە جوانییەکانی پەروەردگارمان شاد دەبین.

## نەفس بە (ڕۆژوو) پەروەردە دەبێت؟

– نەفس چی دەکات؟

– پاڵ بە ئێمەوە دەنێت بۆ گوناه کردن، واتە دەبێتە هۆی تاوانکردنمان، بۆ نموونە لە نوێژکردن ساردمان دەکاتەوە و تەمبەڵمان دەکات، کەموکورتی و تاوانباریی خۆی قبوڵ ناکات، خۆی بە خاوەنی هەموو نیعمەتێك دەزانێت نەك بە هی پەروەردگار! هەرگیز سوپاسگوزار نییە، ناشیەوێت خودا بناسێت، هەرگیزاوهەرگیز حەز لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی پەروەردگار ناکات. حەزی لە هاودەمیی شەیتانە و بەرەو دۆڕان و لەناچوون پەلکێشمان دەکات.

بەڵام تەنها بە بەڕۆژووبوونمان دەتوانین باش نەفسمان پەروەردە بکەین و، هەموو شتێکی بەگوێ نەکەین و، نەبینە کۆیلەی حەز و ئارەزووەکانمان.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و نۆیەم)ەوە وەرگیراوە.

# دونیا جوانترە یاخود دوارۆژ؟



"ئەی مرۆڤ! دەزانیت بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بۆ کوێ ڕاپێچ دەکرێیت؟ بەرەو بەهەشتێك ڕاپێچ دەکرێیت، کە هەزار ساڵی ژیانی پڕ نازونیعمەتی دونیا هاوتای یەك کاتژمێری ژیانی ئەوێ نییە.. لەو بەهەشتەدا بە دیداری پەروەردگاری مەزن شاد دەبیت، کە یەك کاتژمێر لە خزمەتی خودادا بوون لە هەزار ساڵی خۆشییەکانی ناو بەهەشت زۆر خۆشترە".

## با بڵێین ژیانت بەم شێوەیەیە:

هەزار ساڵ بژیت، بەردەوام گەنج بیت و هەرگیز پیر نەبیت، هەمیشە لەشساغ و تەندروست بیت و، قەت نەخۆش نەکەوتبیت، هیچ شوێنێکت ئازاری نەیەت و، هەرگیز ئامۆناڵەت نەکردبێت.

کۆشکێکی جوان و ڕازاوەت لەناو گوڵ و گوڵزاری باخێکی زۆر خۆش و فراواندا هەبێت و، بە خۆشی و ئارامیی و دڵنیایی بژیت.

کەشتییەکی ڕازاوەی زۆر جوانت هەبێت و، هەر کات ویستت بەدەریادا گەشت بکەیت.

ئۆتۆمبێلێکی ئاخر مۆدێل و گرانبەهات هەبێت و، پێی بچیت بۆ هەموو لایەک.

هەلیکۆپتەرێکت هەبێت و هەر کات بێتاقەت بوویت بە ئاسمانی شارەکەتدا پێی بفڕیت و، بۆخۆت لەسەرەوە تەماشای هەموو شتەکان بکەیت.

فڕۆکەیەکی تایبەتیشت هەبێت، تا حەزت لە هەر وڵاتێک یا هەر شوێنکی سەر زەوی بوو بە فڕۆکە گەشت بکەیت بۆی.

لە تەمەنێکی گونجاودا هاوسەرێکی زۆر باش بخوازیت و، منداڵی زۆر باش و صاڵحت بووبێت و، بتوانیت هەموو داوا و پێویستییەکیان بۆ دەستەبەر بکەیت.

هەموو کەسێك بتناسێت و، خۆشیان بوێیت و، ڕێزت بگرن، تۆش یارمەتی هەژاران بدەیت و، کۆمەکیی بێکەسان بکەیت و، دڵنەواییان بکەیت.. جگە لەوەش کەسێکی زۆر دنیادیدە و شارەزا بیت، هیچ جێیەك نەمابێت کە نەتبینیبێت.

مرۆڤەکانی دەورویەرت هەموویان باش و، تێگەیشتوو و ڕەوشت بەرز بن.. ئیتر خۆشت حەزت لە چی بوو هەتبێت و، بە هەموو ئاواتەکانت گەیشتبیت.

دەزانیت بۆچی هەموو ئەمانەم باس کرد؟

لەبەر ئەوەی هەموو ئەمانە یەك کاتژمێری بەهەشت ناهێنن.

با بڵێین خودا بەهەشتی بە نسیب کردیت و، هەموو خواست و خۆزگەکانیشتی هێنایە دی.

لە بەهەشتدا هەزاران کۆشك و، هەزاران خزمەتکار و، سەدان هەزار پەری... هەر نیعمەتێکیشت حەز لێبێت پێت دەبەخشرێت.

هەر خواردن و خواردنەوەیەك بەخەیاڵتدا بێت، پێشکەش دەکرێت و، هەرگیز کۆتاش نایەت.

جا بەهەشت چی تێدا نییە!

هێندەی نیعمەت تێدایە کە تەنانەت ناتوانین بیریشیان لێ بکەینەوە و، بیانژمێرین.

هەموو جوانییەك کە لە دونیادا بوونی نییە، دەنگ و ئاوازی وای تێدایە کە لە دونیادا نییە و، تەنانەت نەشمانتوانیوە بیانبیستین.

گەر حەز بکەیت بچیت بۆ دوورترین جێگە لە یەك چاوتروکاندا دەیگەیتیێ، هەر شتێك کە بە خەیاڵتدا بێت، یەکسەر لەبەردەمتدا ئامادە دەبێت.

نەخۆشی تێدا نییە، ئازار و، ناخۆشی و، غەم و، هەرچییەك کە ڕقت لێی بێت لەوێ نییە، هەموو شتێکت بە زیادەوە پێ دەدرێت.

جگە لەوەش دەزانیت چی دیکەی تێدا نییە؟

مردن! مردنی تێدا نییە، چونکە بۆ تاهەتایە لەوێدا لەگەڵ دایك و باوك و، هاوڕێیان و، خۆشەویستانت دەمێنیتەوە...

هەموو پێغەمبەرانی لێیە (سەلامی خوایان لێ بێت)، تۆش دەتوانیت لە یەك کاتدا لەگەڵ هەموویاندا قسە بکەیت.

پێغەمبەریشمان ﷺ دەبینیت، تا چەندت ئارەزوو لێبوو لە ڕووخساری نوورانی بڕوانیت و، گوێ لە قسەکانی بگریت، چونکە ئەو خۆشەویستە بەتایبەتی چاو لەچاوت دەبڕێت و قسەت لەگەڵ دەکات، ڕەنگە لەو کاتەدا لەخۆشیدا خەریك بێت بفڕیت!

هاوەڵانی پێغەمبەر (خوا لێیان ڕازی بێت) دەبینیت و، یەك بەیەك قسەیان لەگەڵدا دەکەیت، بە دیداری هەموو زانا و، کەسایەتییە چاکەکان شاد دەبیت.

چی و چی دیکەش؟

بەهەشت هەرگیز بەوەندە باسکردن تەواو نابێت، ئەصڵەن کەس ناتوانێت بەتەواوی باسی بکات.

بەکورتی، هەموو ئەو نیعمەتانەی باسمان کردن لەگەڵ ملیۆنەها خۆشی و نیعمەتی دیکەشت پێ دەبەخشرێت، بەڵام لەپڕ مژدەیەك دێت و هەمووان شاگەشکە و دڵخۆش دەکات، کاتێك دەنگێك دەڵێت: "خەڵکی بەهەشت، جوانی پەروەردگارتان دەبینن، پەروەردگاری خۆتان دەبینن!".

بوونەوەران تەنها لە بەهەشتدا دەتوانن پەروەردگار ببینن، ئەوەش بەشێوەیەکە کە تەنها زاتی خۆی دەزانێت.. کەواتە هەزار ساڵ ژیان بەو هەموو نیعمەتەی بەهەشتەوە هێشتا ماوتای یەك کاتژمێر نییە کە تێیدا پەروەردگار ببینرێت.

بەڵام ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە: (سەرەتای ڕێگەی بەهەشت لەم دونیایەوە دەست پێ دەکات)[1].

---

١- لە (مەکتووبی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەم دونیایە چەند ڕووی هەیە؟



– بۆ دونیاش ڕووی هەیە؟

– ئەی باشە ئەوە نییە دەڵێن: (ڕووی ئاسمان، ڕووی زەوی)، کەواتە بۆ دونیا ڕووی نەبێت.

– گەر دونیاش ڕووی هەبێت، کەواتە چەند ڕووی هەیە؟ یەك دانە، دووان، سیان؟

– دونیا سێ ڕووی هەیە.

هەروەك چۆن هەندێ کەس پێیان دەوترێت (دووڕوو)، لەبەرئەوەی ڕووخسار و ناخیان وەك یەك نییە، دونیاش هەر بەم جۆرە چەند ڕوویەکی هەیە.. بەشێوەیەکی ڕوونتر بڵێم، ئێمە بە سێ شێوە لە دونیا دەڕوانین:

یەکەمیان: ئەو ڕووەی لە خودا دەڕوانێت.

دووەم: ئەو ڕووەی لە دوارۆژ دەڕوانێت.

سێیەمیان: ئەو ڕووەی لە تاوانەکان دەڕوانێت.

## - یەکەمین ڕوو، کە لە خودا دەڕوانێت، چۆنە؟

دونیا موڵکی خودایە و، هونەر و جێدەستی خۆیەتی و، بەرهەمی قودرەت و دەسەڵاتییەتی، هەر لە گڵ و خۆڵەوە تا ڕووەکەکان، لە ئاژەڵەکانەوە تا مرۆڤەکان هەموو شتێك هی ئەو زاتەیە و، ئەو زاتەمان پێ دەناسێنن؛ چونکە ئەو بەدییهێناون و، ڕازاندوونیەتەوە و، شێوەیەکی جوان و سەرنجڕاکێشی پێ بەخشیون.

هەموو شتێکی دونیا بە یەکەم جار لێڕوانینی خودامان پێدەناسێنێت و، زانیاریمان دەربارەی بەدیهێنەر دەداتێ.

هەموو بوونەوەرێك وەك ئاوێنەیەك بەدیهێنەرمان پێ پیشان دەدات، بۆ نموونە: خاك ئاوێنەیەکە و، لەو دەنکە تۆوەی کە تێی دەهاوێژرێت، بەرهەمی ڕەنگاوڕەنگی سەوز و زەرد و سوور و شین و مۆر دەداتەوە، واتە ئەم خاکە وێنەی ئەو بەدیهێنەرەیە کە ئەو بەروبوومە جوان و ڕەنگاوڕەنگانەی سەوز کردووە و پێ گەیاندووە.

هەر بۆیە ئێمەش ئەم ڕووەی دونیامان خۆشدەوێت، چونکە بەرەو خودامان دەبات و لەومان نزیك دەکاتەوە، واتایەکیش بە چێژ و

لەزەتی دونیامان دەدات و خۆشییەکانی دونیامان لا شیرینتر دەکات و خەندە دەخاتە سەر لێوەکانمان.

گەر ئەم ڕووەی دونیامان لەبەر ئەوە خۆشویست کە خوامان پێ دەناسێنێت، ئەوا بەمە باوەڕمان بەخوا پتەوتر بووە و، جۆرێکیشە لە پەرستش و، خوای گەورە پاداشتمان بۆ دەنووسێت لەسەری.

کەواتە ئەم ڕووەی دونیا زۆر جوانە و، شیاوی خۆشویستنە نەك نەفرەت لێکردن.

## ڕووی دووەمی دونیا:

دونیا ڕوویەکی دیکەی هەیە کە لە دوارۆژ دەڕوانێت، واتە بۆ دونیای ئاخیرەت.

– دونیا بۆ بڕوادار یا موسوڵمانێك چییە؟ بۆچی لەم دونیایەداین؟ ئەبێ لێرە چی بکەین؟ بەوپێیەی کە بە ئارەزووی خۆمان نەهاتووین، کەواتە بۆچی لێرەین؟

– وەڵامی ئەم پرسیارانە ڕووی دووەمی دونیات پێ دەناسێنێت. دونیا کێڵگەی تۆوچاندن و، نەمام ناشتنە.

– ئەم نەمام ناشتنە چیە و چۆن دەبێت؟ باشە چ سوودێکی بۆ ئێمە هەیە؟

– ئەم جیهانە کێڵگەی ئیمانە و، بێستانی پەرستشە و، نەمامگەی بەندایەتییە، ئەمەش بەو شێوەیەی کە خوای گەورە لە

قورئاندا پیشانی داوین، پاشان پێغەمبەریش ﷺ ڕێنمایی کردووین بۆی، واتە کارکردنمانە بە فەرمانەکانی قورئان پاشان ئامۆژگاری و فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ.

بەم جۆرەش ئەو پاداشتەی کە لە دواڕۆژدا پێویستمان پێی دەبێت لێرەدا کۆی دەکەینەوە.

هەروەك چۆن جووتیار لە بەهاردا یاخود لە پایزدا تۆو دەچێنێت و، کاتێك هاوین یا وەرزی پێگەیشتنی بەرهەمەکەی هات کۆی دەکاتەوە، بەو شێوەیەش ئێمە لەم دونیایە باوەڕ بەخودا دەهێنین و، بەپێی فەرمان و ڕێنماییەکانیشی ڕۆژەکانی ژیانمان بەسەر دەبەین، بۆ ئەوەی سبەی لەو دونیا بە پاداشتێکی وەك بەهەشت و، ئاکامێکی تاهەتایی پڕخۆشگوزەرانی شاد ببین.

بەم بیر و تێگەیشتنەوە دەژین و کاتەکانمان دەنرخێنین و تەمەنمان بەرەکەتدار دەکەین.. بەمەش دەوترێت خزمەتێکی سانا و ساکار و، پەرستشێکی بەردەوام و بێ کەموکورتیی و، پاداشتێکی یەکجار زۆر.. ئێوە دەڵێن چی؟ ئاسانە، وانییە؟

## ڕووی سێیەمی دونیا:

دونیا ڕووی سێیەمیشی هەیە، بەڵام ئەمەیان بۆ ئێمە نییە.

ئەم ڕووەیانی لە تاوان دەڕوانێت و، خراپ و ناشیرینە.

کەسی وا هەیە گوێ بە حەرام و حەڵاڵیی نادات و، لەم دونیایەدا هەرچی بێت بە خەیاڵیدا دەیکات، کەواتە ئەم جۆرە کەسانە دونیا وەك مەیدانێکی تاوانکردن دەبینن و، وەك جێی یاری و ڕابواردن وایە لایان، ڕەنگە خۆت بیستبێتت کە کەسانی لەم شێوەیە دەڵێن: (ئێمە یەکجار دێین بۆ ئەم دونیایە و دەژین، خۆ کە مردین دەچینەوە ناو خاك و، جارێکی دیکەش زیندوو نابینەوە). بەکورتی ئەم جۆرە کەسانە شەرم لە هیچ کەس و شتێك و تەنانەت لە خواش ناکەن و لە گوناهێك ناگەڕێنەوە و، بێباکانە و خوێنساردانە تاوان دەکەن.

ئەو کەسانەی لەم ڕووەی دونیا دەڕوانن، ئەوا بە باقوبریقی دونیا هەڵ دەخەڵەتێن و سەریان لێ دەشێوێت، چونکە بڕوا بەوە ناکەن ڕۆژێك دێت ئەم دونیایە جێدەهێڵن و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و لەسەر گوناهەکانیان سزا دەدرێن.

وابزانم ئێوەش وەك من ئەم ڕووەی دونیاتان لا ناشیرین و خراپ و ناخۆشەویستە و، بە سەرچاوەی هەموو گوناهەکان و خراپییەکانی دەبینن.

وریا بن و، بەم ڕووەی دونیا هەڵ نەخەڵەتێن.[1]

---

١- لە (وتەی سی و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# موعجیزە چییە؟ ئەی بۆچی لەسەر دەستی پێغەمبەرمان ﷺ موعجیزەمان نیشاندراوە؟



خوای گەورە موحەممەدی ﷺ وەك پێغەمبەرێك بۆ ناردوین و، ئەركی پێغەمبەرایەتی پێ سپاردووە، فەرمان و ڕێنماییەكانیشیمان لە ڕێگەی ئەو پێغەمبەرەوە پێ رادەگەیەنێت.

پێغەمبەریشمان ﷺ بەو لێهاتووییەی كە خودا پێی بەخشیوە، هەواڵی پێغەمبەریوونی بە خەڵكی ڕاگەیاند و، بەپێی ئەو قورئانەش كە خوای گەورە بۆی ڕەوانە كرد بوو ناوەڕۆكی پێغەمبەرایەتی خۆی ڕوون كردەوە.

سەرەڕای ئەوەش پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەزارەها موعجیزەی نیشانی خەڵكی دا، تا پێغەمبەرایەتی خۆی بسەلمێنێت.

– موعجیزە یەعنی چی؟

- واتە ڕووداوێکی دەرئاسا کە هیچ کەسێك نەتوانێت بیکات.. خوای گەورە لەکاتی پێویستدا ئەم موعجیزانە بە پێغەمبەرانی دەدات، بەڵام لە بنەڕەتدا موعجیزە بۆ بەڕاست دانانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمانە ﷺ لەلایەن خوداوە.

وەك ئەوەیە پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی بفەرموویێت: (بەڵێ، تۆ پێغەمبەریت، ئێمە تۆمان بۆ ئەو کارە ڕاسپاردووە).

بۆ نموونە: ئەگەر تۆ لەبەردەم دەستەڵاتدارێکدا بە کۆمەڵێك کەس بڵێیت: "جەنابیان منیان بۆ ئەم کارە ڕاسپاردووە"، خەڵکەکە بپرسن: "جا ئێمە چۆن بڕوات پێ بکەین؟".

لەو کاتەدا یەکسەر دەستەڵاتدارەکە بڵێت: "بەڵێ، من ناردوومە بۆ ئەوەی ئەو کارە بکات".

ئەوا قسەکەی تۆی پشتڕاست کردووەتەوە و، پێویست بە هیچ بەڵگەیەکی دیکە ناکات.

خوداش بۆ پشتگیریی بانگەوازەکەی پێغەمبەرمان ﷺ موعجیزەی پێداوە، بۆ نموونە گەر بەسەرهاتی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ بخوێنینەوە، دەبینین بۆ نموونە بەدەست لێدانێکی پێغەمبەرمانﷺ خودا چەندین شتی گۆڕیوە.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە بوخاری لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (لە

سەروبەندی جەنگی حودەیبییەدا خەڵك ئاویان دەست نەدەکەوت و تینوو بوون، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ جامۆڵکەیەك ئاوی پێ بوو و دەیویست دەزنوێژی پێ بگرێت، بۆیە خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش پێی فەرموون: "چیتانە؟" وتیان: جگە لەو جامۆڵکە ئاوەی دەستت هیچ بۆ دەزنوێژ و خواردنەوە شك نابەین، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە ناو جامۆڵکەکەوە و ئاو لە ژێر پەنجەکانییەوە وەك کانی هەڵقولا، ئێمەش تێر ئاومان خواردەوە و دەزنوێژمان گرت)، ئیمامی بوخاری دەڵێت پێم وت: چەند کەس بوون؟ جابر وتی: تەنانەت ئەگەر سەد هەزار کەسیش بووینایە بەشی دەکردین، بەڵام پازدە هەزار کەسێك بووین)[1].

– بۆ ئاو لە پەنجەکانمانەوە دەڕژێت؟!

– نەخێر، بەڵام ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت ئەم یاسایەی لەبەر ویستی پێغەمبەرەکەی دەگۆڕێت، واتە هەر چۆن ئاو لە زەوییەوە هەڵدەقوڵێنێت، ئاوەهاش لە پەنجەکانی پێغەمبەرەوە دەیڕژێت.



---

١- صحيح البخاري : ٣٤٠٢

ڕۆژێك بێ بڕواكان هاتن بۆلای پێغەمبەرمان ﷺ و پێیان وت: ئەگەر تۆ بەڕاستی پێغەمبەریت، ئەوا بەڵگەیەكمان پیشان بدە تا بڕوات پێ بكەین. پێغەمبەریشمان ﷺ لە شەوێكدا كە مانگ چواردە و پڕبوو، خەڵكی مەككەی كۆكردەوە بە ئاماژەیەكی پەنجەی مانگی كرد بە دوو كەرتەوە، تەنانەت خەڵكەكە توانییان كێوی (حیراء) لە نێوان دوو كەرتەكەوە ببینن.[1]

واتە ئەوەی لەسەر زەوییەوە شایەتحاڵی ئەو موعجیزەیە بووە بینیویەتی كە پێغەمبەر ﷺ هێندەی پانایی كێوی حیراء دوو كەرتەكەی مانگی لەیەك دوور خستووەتەوە.

- بۆ بە ئاماژەیەكی پەنجە مانگ دوو كەرت دەبێت؟!

- نەخێر، بەڵام خودا بۆ بەڕاست دانانی بانگەوازەكەی پێغەمبەرمان ﷺ ئەم موعجیزەیەی پێ بەخشی.

---

١- صحيح البخاري: ٤٥٨٨

کاتێك پێغەمبەرﷺ لە ڕێی کۆچ و سەفەردا بە پیاوێکی دەشتەکی گەیشت، پێی فەرموو: "بۆ کوێ دەچیت؟" ئەویش وتی: دەگەڕێمەوە نێو ماڵ و منداڵم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "دەتەوێت بۆخۆت کارێکی چاك بکەیت"، ئەویش وتی: چی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "شایەتی بدە کە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی تر نییە و، محەمەدیش بەندە و پێغەمبەری ئەو زاتەیە"، پیاوەکە وتی، باشە

کـێ شـایەتی لەسـەر ئەمـە دەدات؟ پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمووی: "ئەمە" و، ئاماژەی بۆ دارێك كـرد، دارەكـەش لـەجێی خۆی جـولا و، بەرەو لای ئەمان كەوتەڕێ، وەك مرۆڤیش دەستی كـرد بـە قسـەكردن و، سـێ جـار شـایەتی لەسـەر یـەكتایی خـودا و پێغەمبـەرێتی پێغەمبـەرمانﷺدا، پاشـان گەڕایـەوە شـوێنی خـۆی، كـابرای دەشتەكیش موسوڵمان بوو.. )[1].

– دار و درەخت دەتوانن بڕۆن؟

– نەخێر، بەڵام ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ بیەوێت، ئەوا ئەو دارە بە ئیزنـی خـوای گـەورە واز لـە سـیفەتی داری خـۆی دەهێنێـت و ئـەو فەرمانەی پێیدراوە جێبەجێی دەكات.



كـاتی خـۆ ئامـادەكردن بـۆ جـەنگی (خەنـدەق)، جـابری كـوڕی عەبـدوڵلا (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) هەسـتی كـرد پێغەمبـەر ﷺ برسییەتی، بۆیە خێرا خۆی گەیاندەوە ماڵەوە و، توورەكەیەك جۆیـان هەبوو جوان هاڕیی و، بەرخێكیشی سەربڕی و لەگـەڵ ژنەكەیـدا ژەمـە خواردنێكیان ئامادە كرد. پاشان خۆی گەیانـدەوە لای پێغەمبـەر ﷺ و بانگهێشتی كرد بـۆ نـانخواردن، بـەڵام كاتێـك جـابر پێغەمبـەرﷺ و

---

١– سنن الترمذي: ٣٦٤٨

هەموو هاوەڵانی خەندەق هەڵکەنی بینی وا بەرەو ماڵی ئەمان دێن، زۆر ترسا و لە دڵی خۆیدا وتی: ئەم تۆزە خواردنە چۆن بەشی ئەم هەموو کەسە دەکات! پێغەمبەریش ﷺ بێگومان هەستی کرد کە ئەم هاوەڵە وا ترساوە و خەمییەتی، بۆیە پێی وت هیچ خواردن تێ نەکەن و بەشی مەکەن تا خۆم دێم بەشی دەکەم، ئەوانیش بەگوێیان کرد، بۆیە بە بەرەکەتی پێغەمبەرەوە هەموویان تێریان خوارد و دەستیان هەڵگرت، کەچی هێشتا خواردنەکە وەك خۆی مابووەوە و هێندە کەمی نەکردبوو![1]

– یەعنی خواردنی سێ کەس بەشی هەزار و پێنج سەد کەس دەکات؟

– نەخێر، بەڵام ئەگەر پێغەمبەرمان ﷺ دوعا بکات، ئەوا بەشی سەد هەزاریش دەکات، چونکە ئەو پێغەمبەرە بەناوی خوداوە دەست بۆ هەموو شتێك دەبات، خوداش دوعاکانی گیرادەکات و، داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ دەکات.

---

١– صحيح البخاري: ٣٨٩٢

ئەگەر تەماشای ناوەڕۆکی کارەکە بکەین، موعجیزە کاری خودایە و، هەر خۆیشی بە پێغەمبەرانی دەبەخشێت، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ هەرکات بیەوێت ناتوانێت بە موعجیزە ئیمان بخاتە دڵی خەڵکەوە.. هەموو کاتێکیش ئەم ڕێگەیەی نەدەگرتە بەر، بەڵکو تەنها کاتێک کە پێویست بوایە و خوداش ڕازی لەسەر بوایە دەیتوانی موعجیزە نیشانی خەڵکی بدات، خەڵکیش یان پێی ڕازی دەبوون و باوەڕیان دەهێنا، یاخود باوەڕیان نەدەکرد.[1]

---

١- لە (مەکتووبی نۆزدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# هەموو هەڵسوکەوتێکی پێغەمبەرﷺ موعجیزە بوو؟



ڕاستە هەموو هەڵسوکەوت و جوڵەو وتەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ پێغەمبەرێتی ئەوی دەسەلماند، بەڵام هەموو هەڵسوکەوت و کارێکی موعجیزە نەبوو و، پێویستیش نەبوو کە موعجیزە بێت.

– بۆچی؟

– ئاخر ئەو کاتە پێغەمبەرمانﷺ نەدەبووە پێشەنگ و ڕابەر و پێشڕەومان. چونکە خودا پێغەمبەرمانی ﷺ وەك ئێمە بە مرۆڤ بەدیهێناوە، هەر بۆیە ئەویش وەك ئێمە ژیاوە، وەك ئێمە لە دایك و باوكێكی مرۆڤەوە لەدایك بووە، سەرەتا منداڵ بووە، پاشان پێگەیشتووە و، دواتر هاوسەرگیریی کردووە و، بووەتە باوك.. وەك هەر مرۆڤێکی ئاسایی نەخۆش کەوتووە و، لە جەنگەکاندا بریندار

بووه و، برسی و تینوو بووه، دڵخۆش بووه، غەمبار بووه، پێکەنیوه، گریاوه، نوێژی کردووه، بەڕۆژوو بووه، چووه بۆ حەج، زەکاتی داوه.. تەنانەت خەڵکی قسەی ناشیرینیان پێ وتووه و ئازاریان داوه و، لە شارەکەی خۆی دەریانکردووه و، بۆ کوشتنی دوای کەوتوون.

بێگومان بڕواداران لە خۆیان خۆشتریان ویستووه و، لە فەرمانی دەرنەچوون و، بوونەتە قوتابیی و، بوونەتە هاوڕێ و هاوەڵی.

لە سەرەتاوه چەند کەسێك نەبێ، زۆربەیان بڕوایان پێ نەهێنا، کەچی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لەبەرامبەر ئەم هەموو کارانەدا هەر سەرمەشق بوو و، هەموو هەڵسوکەوت و جووڵەیەکی نموونە بوو بۆمان.

خۆ ئەگەر فریشتە بووایە، یاخود هەموو کارەکانی موعجیزە بوایە، ئەوا ئاوا نەدەبووه نموونە بۆمان و، نەماندەتوانی چاوی لێ بکەین و وەك ئەو هەوڵ بدەین.



پێغەمبەرمانﷺ لە هەموو کارەکانیدا جوانترین و باشترین و ڕاسترین شێواز و کاری هەڵ دەبژارد و، لە هەموو بارودۆخێکدا سوپاسی خودای دەکرد، واتە لە هەبوون و نەبوونییدا، لە خۆشیی و ناخۆشییدا، لە کاتی نەخۆشی و لەشساغیدا هەر سوپاسگوزار بووه.

کاتێك خەڵكی بە قسەیان دەكرد و، كاتێكیش خەڵكی لێی دووردەكەوتنەوە، لە هەر بارودۆخێكدا بوایە بە سەبر و ئارامگر بوو.

زۆرترین نوێژی دەكرد و، زۆرترین ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، ئەو لە هەمووان زیاتر یارمەتی خەڵكی دەدا.



منداڵانی زۆر خۆشدەویست، زۆرباش لەگەڵ هاوەڵان مامەڵەی دەكرد، پارێزگاریی لە هەژاران و بێكەسان و بێ دەرەتانان دەكرد و چاودێریی دەكردن و پێداویستییەكانی بۆ دابین دەكردن، هەر كەسێك بۆ پێویستییەك دەچووە لای بەدەستی خاڵییەوە نەدەگەڕایەوە و پێغەمبەر ﷺ كۆمەكی دەكرد.

زۆر خاكی و، ئازا و بەجەرگ و، نەرمونیان بوو، بەڕاستی هەروەك لۆكە و ئاوریشم نەرمونیان بوو!

دڵپاك و، بەسۆز و، خوێنشیرین و خۆشڕەفتار بوو.. هەر بەم هەموو سیفەتە جوانانەشی بووە ڕابەر و پێشەنگی ئێمە.



ئەو پێغەمبەرە ئازیزەمان ﷺ، هەمیشە و لە هەموو كارێكدا نموونەیەكی بێهاوتایە بۆمان.

بۆ نموونە ئەگەر پێغەمبەرمان هەرگیز نەخۆش نەكەوتایە، كاتێك ئێمە نەخۆش دەكەوین چیمان بكردایە؟ لە كێمان بپرسیایە كە چی

بکەین؟ لەکێوە فێری ئارامگرتن و پاڕانەوە بووبووینایە؟ کێ ڕێی نیشان بدایناینە؟ لە کێوە فێری نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و حەج کردن بووبووینایە؟ چۆن فێر دەبووین ببینە مرۆڤێکی ڕەوشتبەرز و دڵپاك؟

پێغەمبەرمانﷺ هەتا بڵێی لە ژیانیدا ناخۆشیی چەشتووە، بەڵام بەرگەی هەموویانی گرتووە.

بۆ نموونە: ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ هەرگیز برسیی نەبوایە، کاتێك ئێمە هەژار دەکەوتین و، برسی دەبووین چیمان بکردایە؟ لەکێوە فێری قەناعەت و ئارامگرتن بووبووینایە؟

کەواتە پێغەمبەرمان ﷺ هەر وەك ئێمە مرۆڤێکی ئاسایی بووە، بەڵام پێشەوا و سەرمەشقی هەمووما و گشت مرۆڤایەتی بووە و دەبێت.



ئەو موعجیزانەی پێغەمبەرمانﷺ لە لایەن خوای گەورەوە نیشانی خۆی و خەڵکەکەی دەدا، تەنها بۆ سەلماندنی ڕاستیی پێغەمبەرایەتی بووە بۆ ئەوانەی کەللەڕەق بوون و پێداگرییان لەسەر بێباوەڕی کردووە، تەنها بۆ ئەوەی یارمەتی ئەوانە بدات لە باوەڕهێناندا، واتە پێغەمبەرمان ﷺ تەنها کاتێك کە پێویست بووبێت موعجیزەی نیشاندراوە.

ئەگـەر هـەموو کاتێـك و لـە هـەموو شـوێنێکدا مـوعجیزەی نیشاندرایە، ئەو کات هەموو کەس ناچار دەبوو کـە بڕوای پێبێنێـت، ئەمـەش دژی نهێنیـی تاقیکردنـەوە دەبـوو. وەك ئـەوە دەبـوو کـە مامۆسـتا لـەدوای خوێندنـەوەی پرسـیارەکان بـۆ قوتابییـەکان وەڵامەکانیشیان بۆ بخوێنێتەوە، ئەو کاتیش جیاوازیی نێوان قوتـابیی تەمەڵ و زیرەك نەدەما...

ئەگەر بـەو شـێوەیەی ئێسـتا نەبوایـە و هـەمووان ناچـار بوونایـە باوەڕی پێ بکەن، ئـەوکات حـەزرەتی (ئەبوبـەکر) و (ئەبوجـەهل) لـە پلەی ئیماندا وەك یەکیان لێدەهاتەوە و، جیـاوازیی لـە نێـوان بـاش و خراپ نـەدەما و، سـەرئەنجام بەهەشـت و دۆزەخـیش دەبوونـە یـەك؛ چونکە لە جێگەیەکدا کە عەقڵ بەکارنەیەت و بیرکردنەوە تێیدا نەبێت و دەرفەتی سەربەستیی هەڵبژاردن نەبێت، ئـەوا هـیچ بەرپرسـیارییەك لەو جێیـەدا بـوونی نابێـت، هـیچ کەسـێکیش لەسـەر تاوانـەکانی سـزا نادرێت.. بەڵام نە لە دونیا و نە لە دوارۆژدا ژیانێکی یەك ئاڕاستە و بێ هەڵبژاردەی وا بوونی نییە.

لەبـەر ئەمـە مـرۆڤ پاداشـت یـان سـزای هـەموو کارەکـانی وەردەگرێتـەوە، چـونکە یاسـا و ڕێسـاکانی گـەردوون بـەم شـێوازە ڕێکخراون و، ڕەوڕەوەی ژیان بەم جۆرە بەردەوام لە بزاوتدا دەبێـت.[١]

---

١- لە (مەکتووبی نۆزدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

## دەستی پێغەمبەرمان ﷺ خۆی بۆخۆی وەك موعجیزەیەك بووە؟



پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەرکاتێك مشتێك بەرد و چەوی بگرتایە بەدەستییەوە یەکسەر وەك مرۆڤ دەستیان دەکرد بە تەسبیحات و یادی خوا.

پێشتریش باسمان کرد: شەوێکیان لەسەر پێداگریی بێباوەڕانی مەککە پێغەمبەرمان ﷺ بە پەنجەی ئاماژەیەکی بۆ مانگ کرد و، مانگیش یەکسەر بوو بە دوو کەرتەوە.

ئەوەنەبوو کە دەستی پیرۆزی خستە جامێك ئاوەوە، لە هەر دە پەنجەکەیەوە ئاو هەڵدەقوڵا و، خەڵکێکی زۆریش بەو ئاوە تێرئاو بوون.

کاتێك نەخۆشیكیان دەهێنا بۆلای، پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندە دەستی پیرۆزی بە شوێنی ئازارەكەیدا دەهێنا چاك دەبوویەوە.

پێغەمبەرﷺ لە گەشتێكدا، لە جێیەك لایدا و، ویستی كەمێك شیر بكرێت، داوای كرد بزنێكی لە شیر چووەوەی بۆ بێنن، كاتێك كە بزنەكەیان هێنا پێغەمبەرﷺ دەستی موبارەكی هێنا بە گوانەكانی بزنەكەدا و، پاش كەمێك ئەو گوانانە ژیانەوە و شیرێكی زۆریان لێوە هات و، پێغەمبەرﷺ تێری لێ خواردەوە، پاشان ئەبوبەكریش (خوا لێی رازی بێت) لێی خواردەوە.[1]

خواردنێكی كەم كە تەنها بەشی چەند كەسێكی دەكرد، بە دەستلێدانی پێغەمبەرﷺ هێندە بەرەكەتی تێكەوت كە ژمارەیەكی زۆر كەس لێیان خوارد و بەشیشی كردن.

خوای گەورە دەستی پێغەمبەری خۆشەویستمانی هێندە بە بەرەكەت و پیرۆز بەدیهێنابوو، كە سەرچاوەیەكی رووداوە دەرئاسا و سەرسورهێنەرەكانی ئەو سەردەمە بوو..

ئەوەتا كاتێك دەنكە چەو و بەردەكانی كردووەتە مشتی، ئەوانیش زیكر و یادی پەروەردگاریان كردووە.[2]

---

١- المستدرك الحاكم: ٤٢١٧

٢- أخرجه البزار والطبراني في الأوسط، صحّحه الألباني في ظلال الجنة: ١١٤٦.

واتـــه دەســـته میهرەبانانـــەکانی بـــۆ نەخۆشـــەکان دەبـــووە دەرمانخانەیەکی ئیلاهی و، بۆ هەر دەردێك بـەکاری بهێنایـە دەبـووە دەرمان و ئازارشکێن بۆی.



هـەمان دەسـت بـە دەسـتەڵات و ویسـتی پـەروەردگاری مـانگی دوولەت کرد و، بووە کانیاوی ڕەحمەت بۆ هەموان.

هەمان دەست گوانەکانی بزنێك دەژێنێتـەوە و پڕشـیریان دەکـات و، کاتێك خواردنێك دابەش دەکات بەرەکەتداری دەکات.

ئەگـەر تـەنها دەسـتەکانی پێغەمبـەرمان ﷺ هێنـدە پـیرۆز و سەرسـوڕهێنەرانە بێـت و، گـەورەیی و ڕاسـتەڕێی بانگەوازەکـەیی و پشتگیری خوایی بۆ پەیامەکـەی دەربخـات.. تـۆ بڵێـی ئەوانـەی ئـەو دەستەیان گوشـیوە و، دەسـتیان لـەناو ئـەو دەسـتانە نـاوە، چـەندە بەختیار و کامەران بووبن؟

ئیدی ئێمەش بە موسـوڵمان بـوون و، ئیمـان هێنانمـان، هـەروەها شـــوێنکەوتنی ڕێبازەکـــەی پێغەمبـــەر ﷺ و، بـــە قبـــووڵکردنی بانگەوازەکەی و، جێبەجێ کردنی ڕێنماییەکانی لـە ژیـانی ڕۆژانەمانـدا و، بە زیندووکردنـەوەی سـوننەتەکانی و، بـە پێشـەنگ وەرگرتنـی لـە هـەموو بـارێکی ژیانمانـدا، دەگـەین بـە ئاسـتێك کـە بـەدڵ و گیـان پێغەمبەرمان خۆش بوێت و ئەویش ئێمەی خۆش بوێـت و لـە دواڕۆژدا پشت بە خودا ببینین و دەست لەناو دەستی بین.[1]

---

١- لە (مەکتووبی نۆزدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# دایکی شیرینم، بابە گیان



"گەر لە ڕێی خوادا دایك و باوکمان خۆشویست، ئەوا بەو خۆشویستنەمان پەرستشمان کردووە و، هەر بۆیە تا زیاتر پیر بن خۆشەویستییان لەدڵماندا زیاد دەکا".

دایك و باوکم.. دوو مرۆڤی زۆر خۆشەویست و میهرەبانن.

من بەهۆی ئەوانەوە هاتوومەتە ئەم دونیایەوە، واتە ئەوان منییان بە ژین شاد کرد.

کە من کۆرپەیەکی بچووك و بێ دەستەڵات بووم، دایکم منی بۆ ماوەی نۆ مانگ لە سکیدا هەڵگرت و، سەرەڕای هەموو ئازار و ناڕەحەتی و ماندوویەتییەکیشی شیری پێدام، واتە ماوەی دوو ساڵ لە

ڕێی شیری پاکییەوە لە خوێنی خۆی خوێن و، لە گیانی خۆی گیانی پێدام!

دایکم لەباوەشی گرتووم و، نازی پێ داوم، هەرگیز سۆز و میهرەبانی بەرامبەرم کەمی نەکردووە... چەندین ساڵ ماندوونەناسانە شەونخونی بەدیارەوە کردووم، بۆ ئەوەی من بخەوم و، ماندوو نەبم و، بە باشی گەورە ببم..

دایکم نانی پێ داوم و، لە گەرما و سەرما پاراستوومی و، بێ ماندووبوون و بێزاربوون چاودێریی کردووم..

کاتێك من پێدەکەنم ئەویش پێدەکەنێت، کاتێك من دەگریم ئەویش دەگری، کاتێك من نەخۆش دەکەوم ئەویش نەخۆش دەکەوێت، کاتێك من دڵخۆشم ئەویش لەخۆشیاندا خەریکە بفڕێت...

دایکی شیرینم، بۆ ئەوەی من لە ژیاندا بمێنم و، ڕۆڵەیەکی باش بم ژیانت لەپێناومدا کردووەتە قوربانی.

زیادەڕەویی نییە گەر بڵێم لەخۆم زیاتر تۆم خۆشدەوێت!

ئەو خودایەشم زۆر زیاتر خۆشدەوێت کە تۆی بە من بەخشیوە، چونکە هەردووکمانی هێناوەتە دونیاوە و، لە خۆمان زیاتر خۆشی دەوێین. هەروەها پەروەردگار تۆی لا خۆشەویست کردووم، بۆ ئەوەی زیاتر لە زاتی خۆی نزیك ببم.



بابە گیان..

باوکی میهرەبانم، منی بەجۆرێك پەروەردە کردووە کە بتوانم ڕووبەڕووی سەختییەکانی ژیان ببمەوە، هەروەها چیم بوێت بۆم دەکڕێت و، بە میهرەبانییەوە هەموو پێداویستییەکانم بۆ دابین دەکات و، هەموو کاتێك بە خەممەوەیە.

هەموو کاتێك پشت و پەنامە و، بە بەردەوامیی و بە ئارامگرییەوە خەمەکانم لەگەڵ هەڵ دەگرێت و هەوڵ دەدات کێشەکانم بۆ چارە بکات.

هێندەی بیرم بێت لە باوەشی گرتووم و، لەگەڵ خۆی بۆ شوێنی خۆشی بردووم.. لەگەڵ دایکم لە قوتابخانە ناونووسیان کردووم، خۆی خەرجی خوێندنەکەمی کێشاوە و، بە ڕەنج کێشان و ئارەق دەردانی خوێندنی پێ تەواو کردووم، تەنانەت لە خەرجییەکانی خۆی کەم کردووەتەوە تا بیدات بە من و، من لە هیچم کەم نەبێت.

باوکم هەمیشە وەك مامۆستایەك ڕێی بۆ ڕۆشن کردوومەتەوە، هەرکات سەرکەوتوو بوویم ئەو لەخۆشیاندا شاگەشکە بووە و شانازیی پێوە کردووم و، هێندەی تر لە ناخمدا خۆی خۆشەویست کردووە.

باوکم، چی بۆ نەکردووم! هەرچییەکی لەدەست هاتبێت بەوپەڕی فیداکاریی و لەخۆبوردووییەوە و بێ بەرامبەر بۆی کردووم...

بابە گیان، من تۆم زۆر خۆشدەوێت.

پەروەردگاریشم زۆر خۆش دەوێت، لەبەر ئەوەی تۆی پێ بەخشیوم.

بابە گیان، خوای گەورە خۆشەویستی و خۆشویستنی بە من و تۆ و دایکیشم بەخشیوە، کەواتە ئەو فێری کردووین زاتی خۆیمان زیاتر خۆشبوێت.

پەروەردگارم لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی پێکردووم کە تەنانەت پێتان نەڵێم: (ئۆف! !)، بۆ ئەوەی خۆشەویستی ئێوەم لە دڵدا کەم نەبێتەوە، پاشان خۆشەویستی زاتی موبارەکیشی لە ناخمدا زیاتر بکات.

ئەو زاتە چەندین جار لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ڕێنمایی کردووم و ئاگاداری کردوومەتەوە کە کاتێك ئێوە پیربوون بەوپەڕی سۆز و خۆشەویستییەوە خزمەتتان بکەم، چونکە بەم شێوەیە هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژیشدا براوە و سەرفراز دەبم و، شیاوی ڕەزامەندی پەروەردگار دەبم.

خۆشویستن و خزمەتکردنی ئێوە بۆ من پەرستشە و، وەك نوێژ بەندایەتییە، تەنانەت وەکو ڕۆژوو و حەج کردنیش.

چونکە پێغەمبەرمان ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە: ئەگەر ئێوەی دایە و بابە لێم ڕازی نەبن، ئەوا خوداش لێم ڕازی نابێت.

خۆ ئەگەر ئێوە بێزار و ناڕەحەت نەکەم و، لێتان توورە نەبم و، دڵتان نەڕەنجێنم و، تورەتان نەکەم و، ڕەزامەندیی ئێوە بەدەست بهێنم، پشت بە خودا لە بەهەشتدا بۆ هەتاهەتایە پێکەوە دەبین.

دایك و باوکی ئازیزم، ئاواتەخوازم:

پەروەردگاری مەزنم تەمەن درێژتان بکات و، من بکاتە شایستەی ئێوە و، ڕۆڵەیەکی باش بم بۆتان، تا بەهۆی ئێوەوە پاداشتی زیاتر وەربگرم و، بەهەشت ئاوەدان بکەینەوە.

کاتێك دەستی ئێوە دەگوشم وا دەزانم خاوەنی دونیام، کاتێك لە ئامێزتان دەگرم و ماچتان دەکەم، لە ناخمدا گوڵی بەهەشت چرۆ دەکات، کاتێك بە ڕوومدا پێدەکەنن وەختە لە خۆشیاندا بفڕم.

دایك و باوکی ئازیزم، ئێوە گەورەترین سەرمایەی منن، ئێوە هەموو بوونی منن.[١]

---

١- لە وتەی (سی و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەركی ئێمە چییە بەرامبەر كەسە بەتەمەن و گەورەكان؟



"ئەگەر زوو دونیا جێ نەهێڵین، ئەوا بێگومان پیر دەبین.. خۆ ئەگەر تۆ ڕێزی دایك و باوكت نەگرتبێت، ئەوا ڕۆڵەكانی تۆش ڕێزی تۆ ناگرن.. بەڵام گەر دەتەوێت لە دوارۆژدا بە بەهەشت شاد بیت، ئەوا خزمەتی دایك و باوكت بكە و، ڕەزامەندییان بەدەست بهێنە، تەنانەت ئەگەر دونیاشت خۆشدەوێت دووبارە هەر ئەوان لە خۆت ڕازی بكە، با بەهۆی ئەوانەوە ژیانت ئاسوودە و ڕزقت بەرەكەتدار بێت".

سەدان و هەزاران ساڵ لەمەوبەر، زوو زوو شەڕ ڕوویدەدا، لەو كاتانەشدا دوژمنان و چەتەكان لەنیوەی شەودا هەڵیان دەكوتایە سەر

خەڵکی، خەڵکیش نەیاندەتوانی لە کاتی هەڵهاتنندا دارونەداریان لەگەڵ خۆیان بەرن، لەبەر ئەوە شتە بەنرخ و گرانبەهاکانیان لەژێر زەویدا دەشاردەوە، شوێنەکەشیان وا نیشانە دەکرد کە تەنها خۆیان بیناسنەوە.

زۆر جار بەهۆی بارودۆخی سەختی ژیانەوە نەیاندەتوانی کە دووبارە بگەڕێنەوە بۆ سەر زێد و خاك و ئاو و ماڵ و حاڵیان، لە ئاکامدا هەرگیز چاویان بە سەروەت و سامانەکەیان نەدەکەوتەوە.

ئیتر بەم ماڵ و سامانە شاردراوانە وترا گەنجینە، کە لە دواتردا خەڵکی بە شوێنەکانیان دەزانن و دەچن لەجێی ئاسەوار و کەلاوە و داروپەردووی شارە وێرانەکاندا بە چەندین ئامێری پێشکەوتوو بۆ گەنجینەکان دەگەڕێن، جا هەندێکی دەدۆزنەوە و زۆر پێی دەوڵەمەند دەبن.

گەنجینە ئەو شتانە دەگرێتەوە کە نرخی managed ماددیان زۆر بەرزە و گرانبەهان، بەڵام بۆ ئەم دونیایە بایەخیان هەیە و هەر لەم دونیایەشدا دەمێننەوە.

بەڵام گەنجینەیەك هەیە کە دونیا و دوارۆژیشمان ڕزگار دەکات: ئەویش ڕێزگرتن و خزمەتکردنی کەسە بەساڵاچوو و بەتەمەنەکان و، یارمەتیدان و بەدەمەوەچوونیانە.



– ئەم کەسە بەتەمەنانە کێن؟

– ڕەنگە دایك و باوکمان بن، یا باپیرە و داپیرەمان بن، دەشێت پوور و خاڵ و مامەمان بن، یاخود تەنانەت پوور و خاڵ و مامی دایك و باوکمان بن.

– ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر کەسانی بەساڵاچوو چیە؟

– سەرەتا خۆشویستنیان و، ڕووخۆشی و، زمان شیرینی لە ئاستیاندا و، تێگەیشتن و، دڵخۆشکردنیان و، ڕێزگرتنیان.

دواتـــريش ســـەردانكردنيان و، ماچـــكردنى دەســـتەكانيان و، دەستگيرۆيى كردنيان و، بەڕێزەوە دانيشتن لەبەرامبەريانـدا و، قسـە پێنـەبڕينيان و، بەئارامييـەوە گـوێ لێ گرتنيـان و، لـەكاتى پێويسـتدا بەدەمەوە چوونيان، گەر داواى هەر شتێكيان كرد خێرا بۆيان ئامادە بكـەين و، هــەر كاتێـك كارێكيــان پێمــان بــوو زوو بچــين بــەدەم كارەكەيانەوە.

هەموو ئەمەش بۆ ئەوەيە ئەوان لە خۆت ڕازى بكەيت و، وايان لێ بكەيت خۆشيان بوێيت و دوعاى خێر و چاكەت بۆ بكەن.

ڕێز و حورمەتت بەرامبەر كەسە نزيكـەكانت پـێش هـەموو شـتێك ئەركێكى مرۆڤايەتييە.. پاشان چاكەكردن و باش هەڵسوكەوت كردنت لەگەڵيان وەكو نوێژ و ڕۆژوو پەرستشە؛ چونكە ئەمە فەرمانى خودايە و، خودا دەيەوێت لەگەڵيان باش بين.

خواى گەورە لە قورئانى پيرۆزدا زۆر جوان باسى ئەمە دەكات:

(خــوداى پــەروەردگارت فــەرمانى داوە هــەر ئــەو بپەرســتن و، عيبادەت بۆ كەس مەكەن بۆ ئەو نەبێ. هەروەها فەرمانى داوە لەگەڵ باوك و دايكدا ڕەفتارتان چاك بێ، ئەگەر يـەكێكيان لاى تـۆ بـوو و لـە سايەى تۆدا پيربوو، يا هەردووكيان لاى تۆ بوون و لاى تۆ پـير بـوون، هەرگيز ئۆف مەكە لـە دەسـتيان تـا دڵيـان نەيێشـێ و هـەرگيز لێيـان تووڕەمەبە و بەڕوويان‌دا هەڵمەشاخێ و قسەى نـەرم و نيـان و باشـيان

لەگەڵ بکە* باڵی زەلیلییان بۆ دانەوێنە و، خۆت بە ملکەچ پیشان بدە بۆیان و خاکی بە لەگەڵیان و لە خودای خۆت بپاڕێرەوە بڵێ: خودایا وەك ئەوان منیان بە ساوایی و منداڵی پەروەردە کرد تۆیش لەگەڵ ئەوان میهرەبان و بە ڕەحم بە) الإسراء: ٢٣-٢٤.

کەواتە خوای گەورە سەرەتا فەرمانی پێکردووین خۆی بپەرستین، پاش ئەوە فەرمانی پێکردووین باش هەڵسوکەوت لەگەڵ دایك و باوکدا بکەین.

هەرکەسێك خودا بناسێت و باوەڕی پێ هێنابێت، ئەوا دەزانێت کە لە پاش خواپەرستییەوە دووەم ئەرکی چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوکیدا.

پاشان نابێت قسەی ناخۆشیشی لەدەم دەربچێت بەرامبەریان، واتە قسەگەلێکی وەك: "ئۆف!"، "ئیتر بەسە، بێزاربووم لەدەستتان"یان پێ نەڵێت، تا ئەوان دڵیان نەشکێت و ڕەنجاو و غەمبار نەبن.

- بۆ ئەگەر ئەو کەسە ئاخ و ئۆف نەکات چی دەبێت؟

- خودا لێی ڕازی دەبێت و، دەبێتە خۆشەویستی خودا و، گەنجینەی بەهەشت بەدەست دەهێنێت.

پێغەمبەریشمان ﷺ چەندین مژدەی پێداوین و فەرموویەتی:

"ڕەزامەندی خوای گەورە لە ڕازیکردنی دایک و باوکدایە و، تووڕەبوونیشی پەیوەستە بە تووڕەبوونی ئەوانەوە"[1].

پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: پێغەمبەری خوا، دەمەوێت لە ڕێی خوادا بجەنگم، و هاتووم پرس و ڕا بە تۆ بکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "دایکت لە ژیاندا ماوە؟" وتی: بەڵێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "دایکت جێ مەهێڵە و خزمەتی بکە، چونکە بەهەشت لە ژێر پێکانیدایە"[2].

ئەم مژدانە، مژدەی خۆشبەختی بێبڕانەوەیە، مژدەیە بۆ چوونە بەهەشتی تاهەتاییەوە!

هەروەها چاکەکارییمان لەگەڵ دایک و باوک و بەساڵاچووان پاداشتی دونیایشی هەیە؛ چونکە ڕۆژێک دێت، ئێمەش منداڵمان دەبێت، ئێمەش پیر دەبین، ئێمەش دەکەوینە هەمان بارودۆخەوە و، چاوەڕوانی ڕێز و خۆشەویستی لە منداڵەکانمانەوە بکەین، وەک مافی دایک و باوک بوونمان بەسەریانەوە.

---

١- سنن الترمذي: ١٨٧٠

٢- المستدرك الحاكم: ٧٢١٨

لە ڕاستییدا ئەگەر ئێمە بەڕێزەوە ڕەفتارمان لەگەڵ گەورەکانمان کردبێت، ئەوا منداڵەکانیشمان لە داهاتوودا بەڕێزەوە هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن.

گەر ئێمە خزمەتی دایك و باوك و گەورەکانمان کردبێت، منداڵەکانیشمان خزمەتی ئێمە دەکەن.

بەڵام ئەگەر ئێمە لاسارانە مامەڵەیان لەگەڵ بکەین، هەمان شت لە منداڵەکانی خۆمانەوە دەبینینەوە.

هەروەك دەڵێن: (چی بچێنین، هەر ئەوە دەدوورینەوە).



ئەو کەسەی ڕێزی دایك و باوك و گەورەکانی دەگرێت و خزمەتیان دەکات، تەمەنی درێژ دەبێت و ژیانی خۆش و ئاسوودە دەبێت.

– تەمەنیش درێژ دەبێت؟

– بەڵێ!

– چۆن؟

– هەر کەسێك ڕۆڵەیەکی باش و سەلار بێت بۆ دایك و باوکی، ئەوا دایك و باوك و گەورەکانی نزای بۆ دەکەن و خۆشیان دەوێت، بەم شێوەیەش ڕزق و ڕۆزیی زیاد دەکات و، نارەحەتییەکانی کەم دەکات و، تەمەنی بەخۆڕایی و بێبەها تێناپەڕێت، بەڵکو ژیانێکی بە

بەرەكـەت و بەرهەمـدار بەسـەر دەبـات و، كەسـێكی سـەركەتوو و دڵفراوان و دڵئارام دەبێت.

هەروەك زانیمان و دانمـان پێـدا نـا كـە تەمـەن و ژیـان بەدەسـتی خـوای گەورەیـە، بۆیـە گـەر خـودا لـەخۆمان ڕازی بكـەین، ئـەوا تەمەنیشمان درێژ دەبێت و، بە ئاسوودەیی و ئارامیی دەژین.

چـاكەكردن لەگـەڵ دایـك و بـاوك و گەورەكانـدا دەبێتـە هـۆی نەهێشتنی بەڵا و موسیبەتەكان، چونكە خـوای گـەورە بـە بەرەكـەتی نزاو پاڕانەوەكانی ئەوان دەمانپارێزێت.

كەواتە، ڕێزگرتنی بەتەمەنـەكان و چاكەكردن لەگەڵیانـدا دەبێتـە هۆی ڕژانی سۆز و میهرەبانی خوای گەورە بەسەرماندا.

ئەو كەسەی دایك و باوكی ناڕەحەت دەكـات و، ڕێزیـان لێناگرێـت و، خزمەتیان ناكات و، هەواڵیان ناپرسێت و، تەنانەت حەز بە مردنیان دەكات، ئەوا لە دونیا و دواڕۆژدا پەرێشان دەبێت و، هەرگیز ئاسوودە نابێت و بەڵا و موسیبەت و ئازار و ناڕەحەتی لێ نابڕێت.[١]

---

١- لە (مەكتووبی بیست و یەكەم)ەوە وەرگیراوە.

## منداڵان لە بەهەشتدا چۆن دەژین؟



**"ئەو منداڵانەی پێش ئەوەی تەمەنیان بگاتە (١٥) ساڵان دەمرن، خوای گەورە لە شێوەی منداڵانی بەهەشتدا و بەشێوازێکی ڕازاوە و جوان لە بەهەشتدا دەیانژیەنێت، گەر دایك و باوکیشیان بەهەشتی بن ئەوا خوای گەورە هەموویان لە بەهەشتدا بەیەك شاد دەکاتەوە."**

دایکان و، باوکان و، داپیرە و باپیرەکان و هەموو ئەو کەسانەی چاکەکاربووبن و خوایان ناسیبێت دەچنە بەهەشتەوە، جگە لەوانیش منداڵەکان بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە، واتە ئەو منداڵانەی بەر لە تەمەنی لاوێتی و باڵغ بوون مردوون، یەکسەری دەچنە بەهەشتەوە.



گەر ڕوونتر بڵێم، هیچ منداڵێك ناچێته دۆزەخەوە، واته دایك و باوك و خێزانی لەسەر هەر ئاینێك بن ئەوا ئەم كە مرد وەك چۆلەكە و پەپوولە بەهەشت دەڕازێننەوە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (مێردمنداڵانێكی تازە هەڵچوویش ئەگەڕێن بەسەریانا ئەم شەرابەیان دەرخوارد ئەدەن،

کە هەمیشە هەر لەو تەمەنەدا ئەمێننەوە و، ئەگەر بیبیانبینی وا ئەزانی مرواریی هەڵڕژاون) الإنسان:١٩.

خۆشەویستی منداڵ جوانترین نیعمەتی دونیایە، شیرینترین لەزەتە، ئەو دایك و باوکانەی منداڵەکانیان بە ساوایی یا بە بچووکی لەدەست داوە، ئەوا لە بەهەشتدا پەروەردگار چاوودڵیان ڕۆشن دەکاتەوە و بەدیداری ڕۆڵەکانیان شاد دەکاتەوە و، تاهەتایە بەیەکەوە بەخۆشی و شادی دەژین.

لەبەهەشتدا لەدایکبوون نامێنێت، هەر بۆیە ئەو منداڵانەی کە لە تەمەنێکی کەم و بە منداڵی مردوون، لە بەهەشتدا نیعمەتی خۆشەویستی منداڵ بە دایك و باوك و نزیکەکانیان دەبەخشن، بەم شێوەیەش ئەو ئازارە لە بیر دایك و باوکیان دەبەنەوە کە لە دونیادا لە دووری ئەمان چەشتبوویان.

بێگومان ئێوەش خوشك و برا یان کەسی نزیکتان هەبوون کە بە منداڵی مردوون.. ئەوانە لە تەمەنی چەندساڵیدا مردبێتن، ئەوا بە پشتوپەنای خوای گەورە لە بەهەشتدا هەر لەو تەمەنەدا دەیانبیننەوە و پێیان شاد دەبنەوە.

کاتێك منداڵێك کۆچی دوایی دەکات، ئەوا خوا یار بێت دەچێتە بەهەشت و لە ئێمە کەیف خۆشتر دەژی.

هەر بەڕاستی بەهەشت جێگەی کەیفخۆشی و یاری کردنە.

لەویٚ (نییە) بوونی نییە، واتە هەموو شتێك هەیە، ئەوەی کە بە خەیاڵتدا دێت و ئەوەشی کە بە خەیاڵتدا نایەت و، هەرچییەك کە بینیوتە و نەتبینیوە لەویٚ هەیە.

لە بەهەشتدا دەتوانیت وەك باڵندەکان بفڕیت و، وەك ماسییەکان مەلە بکەیت و، لە یەك چاوترووکاندا بگەیتە دوورترین شوێن.

هەر جێیەکت بە خەیاڵدا بێت دەتوانیت یەکسەر بچیت بۆی، حەزیشت لە هەرچی کرد یەکسەر لەبەردەستتدا ئامادە دەبێت.

لەویٚ هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لیٚ بێت) دەبینیت و، لە کۆڕیاندا دادەنیشیت و، سەردانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەکەیت و، لە ڕووخسارە نوورانییەکەی دەڕوانیت.

حەز بە بینینی هەر هاوەڵێکی پێغەمبەر یا دۆست و ئەولیا یا کەسێتییەکی مەزنی ئیسلام بکەیت، پشتیوان بە خودا چاوت پێی دەکەوێت. تەنانەت چەندین نیعمەتی وا جوان و ناوازەی لێیە کە تەنها لە بەهەشتدا هەیە و لە دونیادا نین.

هەموو ئەمانەشت بیٚ هیچ کریٚ یا بەرامبەرێك و، بیٚ ئەوەی هیچ خەرج بکەیت پیٚ دەبەخشرێت، واتە چەندمان ویست دەخۆین و دەخۆینەوە و خۆشی دەگوزەرێنین.

(بەهەشت) تەنها یەك کرێی هەیە، ئەویش پێویستە لەم ژیانی دونیایەدا بدرێت:

کە خۆشویستنی خودایە و ژیانە بە پێی ویست و ئیرادەی موبارەکی خوای گەورە، پاشان ناسینی پێغەمبەرمان ﷺ و شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی و بە پێشەنگ کردنییەتی لە ژیانماندا.[1]

١- لە (وتەی سی و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# منداڵ چۆن دەچێتە بەهەشتەوە؟



سەردەمێك پیاوێك لە زینداندا بوو، واتە لە نێوان چوار دیواری ژووری زیندانەکەیدا بە ئازار و ناڕەحەتی و خەم و پەژارە ڕۆژەکانی بەڕێ دەکرد.

بەتەواوەتی سەربەخۆیی خۆی لەدەستدابوو و، نەیدەتوانی بچێتە دەرەوە، بەویستی خۆشی نەدەگەڕا و، نەیدەتوانی کەسیش ببینێت.

لەم سەروبەندەدا منداڵە خۆشەویست و ئازیزەکەشیان ناردە لای، تا ببێتە هاوزیندان و هاودەمی.

باوکی بەستەزمان هەر بیری دەکردەوە: ئاخر چۆن شتی وا دەبێت؟ خۆم لەم زیندانە تەسك و تارەدا هەزار دەردی سەریم هەبوو، کەچی ئێستا ڕۆڵە بەستەزمانەکەشیان زیندانی کردووم!

منداڵەکە دەگریا و، دەکڕوزایەوە، چونکە حەزی لە دەرەوە بوو، کەچی باوکی نەیدەتوانی نازی بداتێ و بیباتە دەرەوە بۆ باخچە و یاریگا و شاری یاری و یاری لەگەڵ بکات، نەشیدەتوانی بە خوشک و برا و خزمانی ئاشنا بکات.

باوك و کوڕ ژیانێکی تابڵێیت نائارامیان بەسەر دەبرد، بێگومان باوکی بێچارە هەر جارێك لە ڕۆڵەکەی دەڕوانی کسپە لە جەرگییەوە دەهات.

پادشای وڵاتیش هەر کە لە بارودۆخی کابرا ئاگادار بووەوە، لەبەر ئەوەی زۆر بە بەزەیی و میهرەبان بوو یەکسەر پیاوێکی نارد بۆ لای باوکی بەستەزمان، تا پێی بڵێت:

(دەزانم ئەم منداڵە کوڕی تۆیە، خوا تەمەن درێژی بکات، بەڵام یەکێکە لە دانیشتوانی وڵاتەکەی من و گەلەکەم، گەر دەتەوێ، وەرە منداڵەکەت بە من بسپێرە، تا بیبەمە لای خۆم و لە کۆشکێکی گەورەی ڕەنگین و ڕازاوەدا پەروەردە ببێت، بەم جۆرە هەم منداڵەکەت ئاسوودە دەبێت، هەم تۆش لەو ناڕەحەتییە ڕزگارت دەبێت).

باوکی بەستەزمانیش کە ئەمەی بیست، دەستی کرد بە گریان و ئاخ و ئۆف کردن و خەفەت خواردن.. پاشان وتی:

"ئـەوە دەڵـێن چـی؟ ئـەم منداڵـە جگەرگۆشـەی منــە و، تاكـە سەرچاوەی دڵدانەوە و دڵنەواییمە لەم زیندانەدا، بەهۆی ئەوەوە هـیچ نەبێت كەمێك ئازارەكانم كەم دەكات، ئێستە چۆن ئێـوە داوا دەكـەن كە بتاندەمێ؟ نەخێر ناتاندەمێ.."

هاوەڵێكی نزیكی كابرا خۆی لە مەسـەلەكە هەڵقورتانـد و هەوڵیـدا ڕازیی بكات و، پێی وت:

"بـرادەر! تـۆ ئـەزانیت خـەریكی چـیت؟ هـیچ پێویسـت بـە خـەمخواردن ناكـات و، گریـان و ناڵـەت هـیچ دادت نـادات. ئەگـەر تـۆ منداڵەكەت خۆشدەوێت و خەمی ئەوتە، ئەوا لەپێشدا هـەوڵ بـدە لـەم زیندانە تەنگ و نالەبار و ڕزیوە ڕزگاری بكەیت، با بڕوات لـەو كۆشـكە ڕازاوە بەرینەدا بۆخۆی بە ئاسـوودەیی بـژی و، چـی ویسـت بیكـات و سەربەست و ئازاد بێت.

خۆ ئەگەر خەمی خۆشتە و بەدوای بەرژەوەندی تایبـەتیی خۆتـدا دەگـەڕێیت، ئـەوا بـاش بزانــە كـە ئەگـەر كوڕەكـەت لێـرەدا بـۆ خەمڕەوێنیی و دڵدانەوەی خۆت بهێڵێتەوە، ئەوا لێرە تووشـی ئـازار و ئەشكەنجەیەكی زۆر دەبێت و، ئەركێكی زۆریشە بۆ تۆ و، ناڕەحـەت و بێـزارت دەكـات، چـونكە تـۆ ناتوانیـت داواكارییـەكانی بـۆ جێبـەجێ بكەیت و، نازی بكێشیت و، پێداویستییەكانی بۆ دابین بكەیت.

بەڵام ئەگەر بڕواتە ئەو کۆشکەی پادشا، ئەوا هەزاران سوودی بۆ تۆش دەبێت، چونکە مانەوەی کوڕەکەت لەوێ، دەبێتە تکاکارت و هۆی جوڵاندنی بەزەیی پادشا سەبارەت بە تۆ، ئیتر ڕۆژێك دێتەپێش پادشا بەیەکتان شاد بکاتەوە، خۆ بێگومان منداڵەکەت نانێرێتەوە زیندان بۆ لای تۆ، بەڵکو تۆ لە زیندان ئازاد دەکات و دەتباتە کۆشك بۆلای ڕۆڵەکەت، تا لەوێ بەدیتنی شاد و بەختەوەر ببیت.. بەڵام ئەمەش مەرجێکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە متمانە بە پادشا بکەیت و، باوەڕت پێی بێت و گوێڕایەڵی بکەیت".

بەڵێ، ئەم چیرۆکە تەنها نموونەیەك بوو، کە ئەم ڕاستییانەی لێوە تێدەگەین:

بە لەبەرچاوگرتنی بەهەشتی نەبڕاوە و جوانی و خۆشییەکانی، دەبینین ئەم دونیایە جۆرە زیندانێکە و، دایکان و باوکان بە هەزار بەدبەختی ژیانی ئەم دونیایەیان بەڕێ دەکەن، منداڵەکانیشیان هەروا، بەڵام ڕۆژێك دێت پەروەردگار منداڵەکە دەباتەوە بۆلای خۆی و، دایك و باوکی جەرگ سووتاویش مەرگی منداڵەکەیان زۆر پێ ناخۆش دەبێت و، بۆی دەگرین..

باش وایه ئەو دایك و باوكانەی موسیبەتێكی وایان بەسەردا هاتووه، لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەرەوه ﷺ ئەم وانەیە فێربن و بڵێن:

منداڵەكەم بێ گوناه و پاكوبێگەرد بوو، بەڵام ئەو بەندەی خوای گەوره بوو، ئەو زاتە بەدییهێنابوو و بۆی گۆش كردبووم و، من لە دروستكردنی یەك تاڵە موو یاخود یەك نینۆكی منداڵەكەمدا دەستم نەبوو و دەستەوەسان بووم.

ئەگەر مافی من بەسەر منداڵەكەمەوه یەك بێت، ئەوا مافی خودا لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆیە بەسەرییەوه، چونكه ئەو زاتە موبارەكە لە بنەڕەتەوه ئەوی بە ئەمانەت بە من بەخشیوه، من تەنها چاودێریم دەكرد و لە نیعمەتە نەبڕاوەكانی خوای گەورەوە پێویستییەكانم بۆ دابین دەكرد، خوداش لە بەرامبەر ئەمەدا ئەو بەزەیی و خۆشەویستییە بەتام و چێژەی پێ بەخشیبووم كە باوك و دایك بەرامبەر منداڵەكانیان هەستی پێ دەكەن و دەریدەبڕن.

وا ئێستا قۆناغی ئەمانەتداریم تەواو بووه و، خاوەنی ڕاستەقینە ڕۆڵەكەمی بۆ لای خۆی بردەوه، بێگومان خودا زۆر بەسۆز و میهرەبانە لە من زیاتری خۆشدەوێت، چونكه خۆی بەدییهێناوه، گەر من وەك پێویست سۆز و میهرەبانیم بۆ دەرنەبڕیبێ و، پەروەردەم نەكردبێ، ئەوا ئێستا پەروەردگار ئەوی بۆ بارەشی میهرەبانی خۆی

گەڕاندووەتەوە و، لەم دونیا پڕئازار و زیندان و مەینەتییە ڕزگاری کردووە و، بردوویەتیەوە بۆ ژیانی بەهەشتی نەبڕاوە.

ئەگەر نەمردایە و لە دونیادا بمایاتەوە، کێ دەیزانی چۆن دەبێت و چی دەکات؟ لەوانە بوو کەسێکی زۆر خراپ و ڕۆڵەیەکی لاساری لێ دەربچوایە و، ئازاری ئێمەی بدایە و بیرەنجاندینایە، لەبەر ئەمە ملکەچی ویستی پەروەردگارم و هەر چییەك ئەو زاتە بیکات جوانە، خۆ پەروەردگار هەرگیز کاری خراپە و ناشیرین ناکات، من ئیتر لەمە زیاتر ناڕەحەت نابم و شیوەن ناگێڕم و، ڕۆڵەکەم بە بەختەوەر دەزانم.

ئەگەر لە ژیاندا بمایە، ڕەنگە تا چەند ساڵێکی تر خۆشەویستییەکی ئاوێتەی ئازاری بۆ دابین بکردمایە، ئەگەر ڕۆڵەیەکی باش و دڵسۆز و لێهاتووش بوایە لە کاروباری دونیادا یارمەتی دەدام، بەڵام بە مردنەکەی خۆشەویستییەکی بێگەردی دەیان ملیۆنان ساڵی بەهەشتی هەمیشەیی بۆ دەستەبەر کردم و، بوو بە تکاکارم لای خواوەندی میهرەبان، تا منیش بڕۆمە بەهەشتی هەمیشەیی خانەی بەختیاری.. کەواتە ئەگەر بەرژەوەندی خۆشم لێك بدەمەوە، دەبێ هیچ خەفەتێك نەخۆم، چونکە هەر شتێك کە خوا ویستی لەسەر هەبێت، هەر دەبێ ببێت..

بەم جۆرە دایك و باوك خۆیان بۆلای ڕۆڵە جوانەمەرگەکەیان ئامادە دەکەن و، دەبنە بەندەیەکی سوپاسگوزار و خۆشەویستی خودا، لەم بارەشدا هەم منداڵەکە قازانجی کرد و، هەم دایك و باوکیشی...[1]

---

١- لە (مەکتووبی حەڤدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

## باشە ئەو منداڵانەی بە بەڵا و موصیبەت دەمرن و تیادەچن گوناح نین؟



چەندین منداڵ بەهۆی بوومەلەرزەیەکەوە بریندار دەبن و، گیان دەسپێرن..

بۆمبێك دەتەقێتەوە و بەهۆیەوە دەیان منداڵ دەمرن..

نەخۆشییەکی پەتا و گوازراوە بڵاودەبێتەوە و، هەزارەها ئاژەڵ پێی مردار دەبنەوە.

لەدارستانێکدا ئاگرێك دەکەوێتەوە و، تەواوی دارستانەکە و هەموو ئاژەڵەکانی نێویشی دەکات بە خۆڵەمێش.

پەروەردگار هەرگیز بە ناردنی بەڵا و موسیبەتەکان بۆ سەر بوونەوەران ستەم ناکات؟

– واتە ئەو منداڵ و ئاژەڵ و درەختانە گوناح نین؟ ئەی ئەوە ناهەقی نییە بەرامبەریان؟

– نەخێر! نە ستەمە و، نە ناهەقی و، نە حەیفیشە!

چونکە:

یەکەم: خوای گەورە خۆی تاکە خاوەنی موڵك و سامان و هەموو ئەم گەردوونەیە

واتە هیچ بونەوەرێك خۆی خۆی ناهێنێتە بوون و، خاوەنی بوونی خۆی نییە، بەڵکو تەنها خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکی ئەم گەردوونەیە، چونکە هەر خۆی هەموو شت و کەس و بوونەوەر و زیندەوەرانی نێو ئەم گەردوونەی بەدیهێناوە.

بەڕای ئێوە خۆمان خاوەنی جەستەمانین؟ ژیانمان هی خۆمانە؟ هیچ مافێکمان بەسەر دەست و قاچ و، لووت و، گوێمانەوە هەیە؟ ئەگەر دەڵێن بەڵێ باشە پێم ناڵێن لە کوێ کڕیومانن؟ چەندمان پێداون؟

گەر یەکێکمان چاوێکی، یان دەستێکی لەدەست بدات، دەتوانێت دانەیەکی دیکە بێنێتەوە شوێنیان؟

هەرگیز! بەدڵنیاییەوە ناتوانێت، کەسیش لەمەدا مافی ناڕەزایی نییە.



با بۆ ئەم باسە ئەم نموونەیە بهێنینە پێش چاوی خۆمان:

وا دابنێین کە بەرگدروو (خەیات) یا (دیزاینەر)ی جلوبەرگیت و، دەتەوێت پۆشاکێك بەشێوەیەکی دیاریکراو ببڕیت و بدووریت، کەسێکیشت بەکرێ گرتووە تا جلەکان بە بالآی بدوریت، مقەستێکت

گرتووە بەدەستەوە و لەملاولەولا و لەقۆڵ و یەخەکەی دەگریت و، بە پیاوەکە دەڵێیت: هەستە، دانیشە، بچەمێوە، ڕێك بوەستە.

پۆشاکەکەت بە بەری کەسەکە بڕی و درووی. کەچی کاتێك پۆشیی، وای گومان برد کە هی خۆی بێت و وتی: حەیفە ئەم جلە جوانانە ئاوا دەبڕیت و دەدووریت! بەم هەستاندنن و دانیشاندنانەش منت نارەحەت کردووە، تۆ مافی ئەم کارانەت نییە، گوناح نییە وا لە من دەکەیت؟

– بۆ، ئەو کەسە بۆی هەیە بەم شێوەیە قسە بکات و نارەزایی دەرببڕێت؟

– نەخێر، چونکە قوماش و جلەکان هی خۆی نین.

دواتریش ئەو لە بەرامبەر کرێیەکی دیاریکراودا ئەو کارە ئەنجام دەدات.

هەروەکو نموونەکە، جەستەی ئێمەش وەك قوماشی دیزاینەرێکی جلوبەرگ وایە، هی خۆمان نییە، هی ئەو کەسەیە کە بەدیی هێناوە.

خودا جەستەیەکی ڕازێنراوەی بە ئەندامگەلێکی وەك چاو و گوێ و لووت و دەم و دەست و قاچ و چەندین هەستی پێ بەخشیوین، بەردەوامیی و مان و نەمانی ئەم تایبەتمەندییانەش هەر پەیوەستە بە خوای گەورە خۆیەوە.



با بۆ ئەم باسە ئەم نموونەیە بهێنینە پێش چاوی خۆمان:

وا دابنێین کە بەرگدروو (خەیات) یا (دیزاینەر)ی جلوبەرگیت و، دەتەوێت پۆشاکێك بەشێوەیەکی دیاریکراو ببڕیت و بدووریت، کەسێکیشت بەکرێ گرتووە تا جلەکان بە بالآی بدوریت، مقەستێکت

گرتووە بەدەستەوە و لەملاولەولا و لەقۆڵ و یەخەکەی دەگریت و، بە پیاوەکە دەڵێیت: هەستە، دانیشە، بچەمێوە، ڕێك بوەستە.

پۆشاکەکەت بە بەری کەسەکە بڕی و دووری. کەچی کاتێك پۆشیی، وای گومان برد کە هی خۆی بێت و وتی: حەیفە ئەم جلە جوانانە ئاوا دەبڕیت و دەدووریت! بەم هەستاندنن و دانیشاندنانەش منت ناڕەحەت کردووە، تۆ مافی ئەم کارانەت نییە، گوناح نییە وا لە من دەکەیت؟

– بۆ، ئەو کەسە بۆی هەیە بەم شێوەیە قسە بکات و ناڕەزایی دەرببڕێت؟

– نەخێر، چونکە قوماش و جلەکان هی خۆی نین.

دواتریش ئەو لە بەرامبەر کرێیەکی دیاریکراودا ئەو کارە ئەنجام دەدات.

هەروەکو نموونەکە، جەستەی ئێمەش وەك قوماشی دیزاینەرێکی جلوبەرگ وایە، هی خۆمان نییە، هی ئەو کەسەیە کە بەدیی هێناوە.

خودا جەستەیەکی ڕازێنراوەی بە ئەندامگەلێکی وەك چاو و گوێ و لووت و دەم و دەست و قاچ و چەندین هەستی پێ بەخشیوین، بەردەوامیی و مان و نەمانی ئەم تایبەتمەندییانەش هەر پەیوەستە بە خوای گەورە خۆیەوە.

هەروەها خودا چەندین ناوی هەیە و، خاوەنی زۆر هونەرە و، چەندەها نەخشیشی هەیە، هەروەك نموونەی بەرگدرووەكە.

واتە بەویستی خۆی جەستەمان دەگۆڕێت... چونكە ئەو خاوەن بڕیارە.

بۆ نموونە: خودا هونەری شیفا بەخشینی هەیە و، یەكێك لە ناوە پیرۆزەكانیشی (الشافي)یە.. بۆ ئەوەی ئەم هونەرەمان نیشان بدات نەخۆشیمان بۆ دەنێرێت، بۆ هەر نەخۆشییەكیش دەرمانێكی تایبەتی بەدیهێناوە، ئێمەش كاتێك دەرمانەكە دەدۆزینەوە، پاش بەكارهێنانی چاك دەبینەوە و، بەمەش هونەری شیفا بەخشینی خودا دێتە دی.

خودا هونەری ڕۆزی بەخشینی هەیە، یەكێك لە ناوە پیرۆزەكانیشی (الرزاق)ە، بۆ ئەوەی ئەم هونەرەیمان نیشان بدات برسیی و تینوومان دەكات، هەر لەم نێوەندەشدا چەندین جۆر خواردن و خواردنەوەشی بۆ بەدیهێناوین، تا ئێمە تینوویەتی و برسییەتیمانیان پێ نەهێڵێن، بەم چەشنەش هەست بە مەزنی و ناوازەیی هونەری ڕۆزی بەخشینی خودا دەكەین.

پەروەردگار هونەری بەخشینی پشوودرێژی و ئارامیی هەیە، یەكێكی دی لە ناوە پیرۆزەكانیشی (الصبور)ە، بۆ نیشاندانی ئەم هونەرەی بەسەرمانەوە، ڕووداوێكمان بەسەردا دێت، یاخود تووشی بەڵایەك دەبین، ئێمەش لەبەر ئەوەی دەزانین كە ئەمە لەلایەن

خوداوەیە، سەبر و ئارامیی لەسەر دەگرین، بەم جۆرەش هونەری ئارام بەخشینی خوای گەورە دێتەدی.

ئێستا ئێمە مافی نارەزایی و کرووزانەوە و شیوەنکردنمان هەیە؟!

نەخێر، چونکە تەنها خوای بەدیهێنەرمان خاوەنی ژیان و جەستەمانە و، بۆ نیشاندانی هونەرەکانی خۆی لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە دەمانگۆڕێت.

لەم نێوەندەشدا، ئێمە پێشەکی تەواو دڵنیا بووین و خەمی چارەنووسمان نییە.

لەبەر ئەوەی لە پاش نەخۆشکەوتنمان چاك دەبینەوە و، دڵخۆش دەبین پێی و، سوپاسگوزار دەبین.. لەدوای برسێتی نان دەخۆین و، چێژی لێ دەبینین و، ستایشی خودای لەسەر دەکەین، دەزانین کە ڕووداو و موسیبەتەکان لەلایەن خوداوەن، هەر بۆیە ئارامگر دەبین لەسەریان، بەمەش چێژێکی تایبەتی ئیمانی دەچێژین.

ئەو ڕووداوانەی بەسەر منداڵان و بوونەوەرە بێتاوانەکاندا دێت ستەم و ناهەقی نین.

با ئەمە بە چەند نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

ئێمە تۆو دەچێنین و، گەنمەمان لێیەوە دەست دەکەوێت، پاشان گەنمەکە دەهاڕین و هەویری لێ سازدەکەین، هەویرەکە لەناو فڕن

دەنێین و نانی پێ دروست دەکەین، ئێستا دەتوانین بڵێین ئێمە بەم کارەمان ستەممان لە دانەوێڵەکان کردووە.

دارودرەختەکان دەبڕینەوە، پاشان دەیانکەین بە کەلوپەل و کەرەستە و بەکاریان دەهێنین، ئێستا بەمە بووینەتە بکوژی دارەکان؟

گۆشتی مریشك و پەلەوەر لێ دەنێین و، خزمەتی میوانەکانمانی پێ دەکەین، ئایا ئەمە ناهەقییە بەرامبەر بە مریشك؟

ماسی ڕاودەکەین و دەیبرژێنین یان سووری دەکەینەوە، ئەی ئەمە ستەمە لە ماسییەکان؟

کاتێك گۆشتی بەرخ دەکەین بە کەباب، ئازاری بەرخەکەمان داوە؟

هەموو ئەم پرسیارانە یەك وەڵامیان هەیە ئەویش ئەوەیە: ئەم کارانەمان هیچ هەڵە و ستەمکاریی نین.

– بۆچی؟

– چونکە خوای گەورە ئەم بوونەوەرانەی بۆ ئێمە بەدی هێناوە، تا بەپێی پێویستیمان بە ئارەزووی خۆمان بتوانین سوودمەند بین لێیان.

کەواتە ئەو بەڵا و ناڕەحەتیانەی بەسەر منداڵەکاندا دێت، ستەم و ناهەقی و سزا و ئازار نییە؛ چونکە ئەوەی ئەوانی لە نەبوونەوە

هێناوەتە بوون خودای گەورەیە، ئەو زاتەش کە بە سۆز و میهرەبانییەوە دەیانژیەنێت، هەر خودایە.

پەروەردگار ئەوانی لە خۆیان خۆشتر دەوێت و، لە خۆشیان زیاتر لە خەمیاندایە، ڕاستە تووشی ناخۆشی و بەڵا و چەند ڕووداوێکیان دەکات، بەڵام لە موسیبەتی زۆر گەورەتر ڕزگاریان دەکات، بەمە لەگەڵ نارەحەتییەکانی ژیان ڕایان دەهێنێت، تا بەسەر بەربەستی زۆر سەختتردا سەریان بخات.

هەر شتێك لە ژیاندا بێت خۆی لەخۆیدا جوانە، گرنگ ئەوەیە بزانین لە کوێوە دێت، ئەگەر هەست بکەین لە بەدیهێنەری زانا و خەمخۆرمانەوە دێت ئەوا هیچ قەیدی نییە و، گوێی پێ نادەین و، زۆر بۆی داناچڵەکێین؛ چونکە بڕوامان وایە کە پەروەردگار هیچ شتێکمان بەسەردا نایهێنێت کە زیانی هەبێت بۆمان و لە بەرژەوەندیماندا نەبێت.

بیربکەنەوە، دایکمان میهرەبانترە یاخود پەروەردگار؟

بەدڵنیاییـــەوە پــەروەردگارمان، چــونکە هــەر خــوای گــەورە سەرچاوەی سۆز و میهرەبانیی دایکیشمانە.



- ئایا دایکمان زیاتر مافی بەسەرمانەوەیە یان خوای گەورە؟

- بێگومان خودا، چونکە جەستەمان، ڕۆحمان، هەموو شتێکمان هی ئەوە، پەروەردگار هەموو شتێکی پێ بەخشیوین.

کەوابوو هەر شتێك خودا بیكات بۆ باشیی و بەرژەوەندیی ئێمەیە، ئاخر خوای گەورە چاكەی ئێمەی دەوێت و، هەرگیز لە دژمان نابێت. هەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەمان لەیادبێت كە دەفەرموێت: (بێگومان خودا بە هیچ ئەندازەیێ ستەم لە خەڵك ناكات) یونس:٤٤.

باشە ئەی مردن چی؟

ئەوە خۆی دەرگای چوونە ناو بەهەشتە، گەر منداڵەكان پێش تەمەنی پازدە ساڵی بمرن دەچنە بەهەشتەوە، چونكە تا ئەو تەمەنە بە بێ تاوان لەقەڵەم دەدرێن، جا بێ گوناه و تاوان چوونە بەهەشتەوە بۆچی كارێكی خراپ و ستەمكارانە بێت؟

خۆ ئەگەر كەسێك تەمەنی منداڵی تەواو كرد و باڵغ بوو، ئەوا باسی لێپرسینەوە و دۆزەخیش دێتە مەیدانەوە.. زۆر كاتیش مرۆڤ ناتوانێت ئیمانی خۆی بپارێزێت، هەر بۆیە باشتر وایە كە بڵێین:

خوایە گیان! هەر چییەك لە لایەن تۆوە بێت، بەخێر بێت و، سەرچاوانمان هات.[1]

---

١- لە (مەكتووبی دوازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# مردن جوانە؟



هەموومان لەگەڵ بیستنی وشەی (مردن)دا یەکسەر ناوچاوانمان گرژ دەبێت، وا نییە؟

هەر کاتێك هەواڵی مردنێك دەبیستین، بزە لەسەر لێوەکانمان نامێنێت.

کاتێك ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی مردوو دەبینین کزە لە جەرگمانەوە دێت، کە بەلای گۆڕستانێکدا تێدەپەڕین هەستێکی سەیر داماندەگرێت.

– ئایا لە ڕاستیدا مردن ترسناکە؟ ناشیرینە؟ شتێکی هێندە خراپە؟

– نەخێر، مردن ترسناك و ناشیرین نییە، بەڵکو ئەویش وەك ژیان جوانە و، نیعمەتێکی خودایە.

دەزانم کاتێك بۆ یەکەمجار لەم وتەیە ڕادەمێنیت کەمێك نەگونجاو دێتە بەرچاوت.

دەی خۆ هەموو ڕاستییەکان سەرەتا بەم جۆرە نەشیاو دێنە پێش چاوی مرۆڤ و، هیچ کەس نایەوێت قەناعەتیان پێ بکات.

- ئێمە بەر لەوەی بێینە ئەم دونیاوە هەبووین؟
- نەخێر، واتە جۆرە مردوویەك بووین.
- پاشان چی بوو؟
- هاتینە دونیاوە و، پاش ئەمەش دووبارە دەمرینەوە.
- بۆچی دیسانەوە دەگەڕێینەوە بۆ قۆناغی مردن و نەبوونمان؟
- بۆ ئەوەی بە ژیانی نەبڕاوە شادبین.
- ژیانی نەبڕاوە چییە؟
- واتە ژیانێك کە مردنی تێدا نەبێت.

ناوکی قەیسی لە خاکدا دەنێژرێت، بۆ ئەوەی ببێتە درەخت، وا نییە؟

مرۆڤیش لە خاکدا دەنێژرێت تا دووبارە زیندوو ببێتەوە و بە ژیانێکی نەبڕاوە شادبێت.

– تێناگەم، ئاخر مردن چۆن دەبێتە نیعمەت و جوان دەنوێنێت؟

– نیعمەت، واتە ئەو شتە باش و جوانانەی خودا بە ئێمەی بەخشیوە، هەر شتێکیش خودا بیبەخشێت جوانە.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە خۆی جوانە، هەر چییەکیش لەوەوە بێت جوانە، کەواتە مردنیش جوانە، خۆ مردنیش هەر نیعمەتێکی خوایە.

– چۆن؟

– یەکەم:

مرۆڤ وەك کۆرپەیەك لەدایك دەبێت، پاشان گەورە دەبێت، دواتر پیر دەبێت و، دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە ئەو کارانەی پێشتر بە ئاسانی ئەنجامی دەدان، ئێستا توانای بەسەریاندا ناشکێت، ڕۆژگارێکی بەسەردا دێت ژیانی لەسەر قورس دەبێت، ئیدی ناتوانێت بەردەوام بێت.

ئەژنۆی دەداتە ئێش و ئازار، ڕۆماتیزمە و هەزار دەردی لێ پەیدا دەبێت، بەزەحمەت دەڕوات بەڕێدا، چاوەکانی کز دەبن، بەحاڵ شتیان پێ دەبینێت، گوێکانی گران دەبن، بەهەزار حاڵ شت دەبیستێت، پشتی دەکۆمێتەوە و، وردە وردە توانای ڕۆشتنی نامێنێت، دەرزی و دەرمان و دکتۆریش چارەی ناکەن.

کاتی وای بەسەردا دێت هەرچی جەستەیەتی نرکە و ناڵەیەتی و، ئیتر کۆڵەبەرەی ژیانی یەکجار قورس دەبێت.

لەم ساتە وەختانەدا مرۆڤ تامەزرۆییەکی لا دروست دەبێت و، حەز دەکات بچێت بۆ ئەو جێیەی دۆست و خۆشەویستانی کۆچیان بۆ کردووە.

– ئەو جێیە کوێیە؟

– بەرزەخ، جیهانی پاش مردن، ئەو جێیەی هەموو پێغەمبەران و لەسەروو هەمووشیانەوە پێغەمبەری ئازیزمانی لێیە (سەلامی خودا لە هەموویان بێت)، ئەو جێیەی دۆستانی خودا و، باپیرانمان و، کەسە نزیکەکانمان و، هەموو ئەو کەسانەی لێیە کە لە مێژوودا ناویانت بیستووە.

هەست ناکەیت هەموو مرۆڤێك تامەزرۆی گەیشتن بە جێیەکی وا بێت؟ ئەی باشە تۆش حەزی پێ ناکەیت؟

دووەم:

ئەم دونیایە پڕە لە دەردی سەری و ناڕەحەتی و مەترسی... وەك بوومەلەرزە و، ڕووداو و، هەژاری و نەبوونی، قاتوقڕی.. کارەسات و، نەخۆشیش هەمیشە لە دەورتن.

ئەگەر بە باشیی لە دونیا وردبینەوە، دەبینین زیندانە و، لە شێوێکی بە شیش و تەل دەورەدراو دەچێت.

– دونیا بە بەراورد بە کوێ ئاوا ناخۆشە؟

– بە بەراورد بە دواڕۆژ و بەهەشتی نەبڕاوە.

– هیچ مرۆڤێك تامەتایە لەدونیادا دەمێنێتەوە؟

– لەم سەردەمەماندا مرۆڤ نییە هەزار ساڵ بژی، تەنانەت بەشێکی کەمی مرۆڤەکان سەد ساڵ بەزەحمەت تەواو دەکەن.

ڕۆژێك مرۆڤ لەم زیندانی دونیایە ڕزگاری دەبێت و، دەچێتە جێیەك کە دوورە لە ناڕەحەتیی و سەرئێشە.

ئەو جیهانە بۆ کەسێکە کە خودای خۆشبوێت و خوداش ئەوی خۆشبوێت، تا بڵێیت شوێنێکی فراوان و پڕ خۆشی و ئاسوودەییە، کەواتە مردن ئێمە لە زیندانەوە بەرەو بەهەشت و، لە ئازار و ناڕەحەتییەوە بەرەو خۆشگوزەرانیی دەبات.

لەبەر ئەوە مردن جوانە، نیعمەتە، چۆن نیعمەتێکیش!

سێیەم:

بۆ ساتێك بهێنە پێش چاوت کە مردن بوونی نییە و، وای دابنێ کە کەس نامرێت.

لەم کەینوبەینەدا تەنها بیر لە ماڵی خۆتان بکەوە.. چەند کەسی پیر دەبینیت؟

باپیرەت، باپیرەی باپیرەت، باپیرەی ئەویش، باپیرەی ئەویش، دەیەها باپیرە و، دەیەها داپیرە.

یەکێکیان سەدساڵە، ئەوی دیکەیان سەد و پەنجا ساڵە و، یەکێکی دیکەیان دووسەدی تەواو کردووە، ئەوی دیکەیان دەڵێن سێ سەد ساڵە.

یەکێ نانی بۆ ناخورێ، یەکێ ئاوی بۆ ناخورێتەوە، یەکێکی دیکەیان ناتوانێت لەجێی خۆی بجولێت.. هەریەکەیان بەدەردێکەوە دەناڵێنێت.

ئەوکات چیتان دەکرد؟ چاودێری کام لەمانەتان پێ دەکرا؟ ئاگاداری کامیان دەبوون؟ هاودەمی کامیانتان دەکرد؟

لە بارودۆخێکی ئاوادا ژیان چەند بە ئازار دەبوو بۆتان!

بەهۆی ئەوانەوە چەندێك نیگەران و ماندوو دەبوون!

لەم بارەدا چەند ئارەزووی نیعمەتێکی وەك مردنتان دەکرد؟

دڵنیام ئێستە دەڵێن: سوپاس بۆ خوا، بەس نییە مردنیش هەیە.



چوارەم:

ئەگەر کار بکەین ماندوو دەبین، کە ماندووش بووین پێویستمان بە حەوانەوە و خەو دەبێت، بۆیە دەخەوین، چونکە بە خەوتن ماندوویەتیمان دەڕەوێتەوە و ئیسراحەت دەکەین و، بە جەستەیەکی پڕ وزەوە لە خەو هەڵدەستین.

نووستن بۆ نەخۆش و، مرۆڤە زەحمەتکێشەکان و، خاوەن دەرد و مەینەتییەکان دەرفەتێکی باشە بۆ پشوودان.

ئەما ڕەنگە خۆشتان بیستبێتتان دەڵێن: "خەو برا بچووکی مەرگە". هەر بەڕاستی وایە، مرۆڤ کە چووە قوڵایی خەوەوە بە نیوەمردوو هەژمار دەکرێت و، تەنها بە هەناسەدانیدا دەزانین کە زیندووە.

دەی مردنیش هاوشێوەی خەوە و، بە واتای پشوودان و ئیسراحەت دێت، بەتایبەت بۆ کەسە زۆر نەخۆشەکان و، ئەوانەی زۆر بەڵا و موسیبەتیان بەسەردا هاتووە و، ئەوانەش کە بەتەواوی لە دونیا وەڕس بوون.

مردن بۆ مرۆڤی باوەڕدار و موسوڵمان نیعمەتێکە، ڕەحمەتێکە، ئارامییەکە، پشوودانێکە.

شاعیرێك وتویەتی:

ئەگەر مردن هیچ جوانییەکی تێدا نەبوایە، ئەوا پێغەمبەری ئازیزمانﷺ چۆن دەمرد.[1]

---

١- لە (مەکتووبی یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

# شەهید یەعنی چی؟ ئەی ئازاری گیانکێشان و مردن دەچێژێت؟



دوو کەس هەمان خەون دەبینن و، لە خەونیاندا ڕۆشتنە ناو کۆشکێکی یەکجار خۆش و ڕازاوەی وەك بەهەشتەوە، کە پڕبوو لە خواردن و خواردنەوەی زۆر و زەبەن و، تا پیاسە و گەڕانیان بە نێویدا بکردایە هەر تەواو نەدەبوو.. ئەوانیش تا تێربوون خواردیان و، خواردیانەوە و، بۆخۆیان بەنێویدا گەڕان و، کاتێکی زۆر خۆشیان بەسەر برد.

یەکێکیان لە خەونەکەیدا دەیزانی خەون دەبینێت و، ئەو شتانەی دەیانبینێت ڕاستی نین، هەر بۆیە تام و لەززەتێکی کەمی لە خۆشیەکانی ئەو خەونەی دەچەشت، چونکە خۆی بەخۆی دەوت:

"ئێستا نا ئێستا خەبەرم دەبێتەوە و، ئەم خۆشی و لەززەتە نامێنێت"!.

برادەرەکەی تر نەیدەزانی کە ئەوەی دەیبینێت خەونە، لەبەر ئەوە هەستی بە لەززەت و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێ گەرد دەکرد.

ئەم خەونە نموونەیەکە بۆ ئێمە تا تێبگەین:

ئەو دوو برادەرەی خەونەکەیان دیت، دوو مرۆڤن کە مردوون و گیانیان سپاردووە، یەکێکیان بەشێوەیەکی ئاسایی مردووە و، لەناو گۆڕی خۆیدا نێژراوە و، دەزانێت کە مردووە، بۆیە کاری بەم دونیایەوە نییە، خۆ ئەگەر بە باوەڕدارییش کۆچی دوایی کردبێت، ئەوا گۆڕەکەی بۆ دەکرێت بە باخێك لە باخەکانی بەهەشت و، چێژ و لەززەت لە نیعمەتەکانی دەبینێت و، تا ڕۆژی قیامەتیش بەم چەشنە دەگوزەرێنێت.

لەهەمان کاتدا برادەرەکەی دیکە هەستی بەوە نەکردووە کە مردووە، هەر وا دەزانێت لەژیاندا ماوە.. دەزانێت کە چووەتە جیهانێکی باشتر لە دونیاوە، بەڵام لەبەرئەوەی خودا ئازاری گیانکێشانی پێ نەچەشتووە، بۆیە هەر وا هەست دەکات کە نەمردووە، ئەم مرۆڤەش پێی دەوترێت (شەهید)، چونکە ژیانی ناو گۆڕی (شەهید) بەم شێوەیەیە.

**کەواتە شەهید یەعنی چی؟**

شەهید بڕوادارێکە کە ژیانی لە ڕێگای خودادا بەخت کردووە و گیانی لەپێناوی پاراستنی پەیامی خواییدا کردووەتە قوربانی.

شەهیدەکان لە گۆڕەکانیاندا ژیانێکی بەهەشتیانە دەگوزەرێنن و، تەماشای بەهەشتەکەی خۆیان دەکەن و لەززەتێکی تەواو بێ کەموکوڕی دەچێژن و کەیف و سەفا دەکەن، واتە لە جیهانێکی بێ ئازار و کەموکورتیدا دەژین.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی شەهیدەکان دەفەرموویت: (ئەوانەی لە ڕێگای خودادا دەکوژرێن پێیان مەڵێن مردوو. ئەوانە زیندوون، بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن و نایزانن) البقرة:١٥٤

کەواتە شەهیدەکان لە گۆڕدا شێوازێك ژیانی تایبەت بەخۆیان هەیە، (باپیرە نوور)یش دەڵێت:

خوشکەزایەکم هەبوو ناوی (عوبەید) بوو، قوتابی خۆم بوو و لە یەکەم جەنگی جیهانیدا لە تەنیشت منەوە و لەبری من شەهید بوو، جا هەرچەند من لە دیلیدا بووم و نەمدەزانی ئەو لە کوێ نێژراوە و، سێ مانگە پێش لە شوێنی ناشتنیەوە دوور بووم، کەچی لە خەونێکدا



کە پێم وایە (رۆیا صادقة)بوو، ڕۆشتمە ناو گۆڕەکەیە، کە لە خانوویەك دەچوو لەژێر زەویدا بنیات نرابێت. لەو خەونەدا ئەوم لە چینی پلەی شەهیداندا بینی. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە من مردووم و پێی ڕاگەیاندم کە زۆر بۆم گریاوە! باوەڕیشی وابوو کە هێشتا خۆی ماوە، بەڵام لەتاو مەترسیی داگیرکردنی ڕووس خانوویەکی جوانی لەژێر زەویدا بۆ خۆی بنیات ناوە![1]

---

١- لە (مەکتووبی یەکەم)ەوە وەگیراوە.

## خووەکانمان چۆن دەگۆڕێن؟



پێشینان وتویانە: "گیان لێت جیادەبێتەوە و لە جەستەت دەردەچێت، بەڵام خوو لێت جیانابێتەوە"، یا "خوویەك گرتت بە شیری، تەرکی ناکەیت بە پیری".

هەموومان چەند خوو و هەست و ئارەزوویەکمان هەیە، کە هەرگیز بە خەیاڵماندا نەهاتووە بیانگۆڕین یا نەیانهێڵین.

کەسێك بهێننە پێش چاوتان.. ئەم کەسە مرۆڤێکی گورجوگۆڵ و زۆر سوورە لەسەر کردنی کارەکانی، هەر کارێك بکاتە ئامانج، ئەوا بۆ گەیشتن پێی هەموو توانایەکی خۆی دەخاتە گەڕ و، تووشی چەندین ناڕەحەتی و چەرمەسەری دەبێت.

با بڵێین ئەو ئامانجەی خەیاڵی داگیرکردووە، بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆرە، هەر بۆیە شەو و ڕۆژی یەکخستووە و، خەو و خواردنی لەخۆی حەرام کردووە بۆ بەدەستهێنانی.

ورده ورده پەیوەندی لەگەڵ برادەرەکانیدا کز دەبێت و کەم کەم نەبێت نایانبینێت، جاری واش هەیە نانخواردنی بیردەچێتەوە، نوێژەکانی دوادەخات، تەنانەت جاری وا هەیە هەر ناشیان کات.

- باشە هەموو ئەمە لەپێناو بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر و دەوڵەمەندبووندایە؟ بۆ گەر دەوڵەمەند بوو، چی دەبێت؟

- ئەوکاتە حەزی لە هەرچی بوو دەیکڕێت، چۆنی بوێت پارە خەرج دەکات، چونکە گیرفانەکانی پڕ لە پارە دەبن.

بەدەستهێنانی پارە هۆ و پێناو ئامرازێکە، کەچی دەبینیت ئەو کەسە ئامرازەکەی کردووەتە ئامانج و، کۆڵنەدان و سووربوون و پێداگریی لەجێی خۆیدا بەکارنەهێناوە، بەڵکو زیادەڕۆیی تێدا کردووە.

بۆیە دروست نییە بەم کەسە بڵێین: (هێندە سوور مەبە لەسەر کارەکانت!)، (چییە ئەم هەموو دەوڵەمەندییە!)، (زۆر چاوبرسیت، ئەزانیت؟).

- ئەی باشە چی پێ بڵێین؟

– بڕوانــە ! خــوای گــەورە ئــەم هــەموو سـیفەتە باشـانەی پــێ بەخشـیویت: کۆڵنــەدەر و ماندوونەناسـیت و، دەتوانیـت چـیت بوێـت بەدەسـتی بهێنیـت، کەواتـە تەمـەن و ژیانـت تـەنها بـۆ ئـەم دونیایـە تەرخان مەکە، چونکە داماتوویەکی نـەبڕاوەت لەبەردەمدایـە، کەواتـە بازرگانیی دواڕۆژت فەرامۆش مەکە و، هـەوڵی بەدەسـتهێنانی سـامانی ڕاستەقینە بدە.

مادام کەسـێکی بـوێر و تێکۆشـەریت، کەواتـە دونیـا و دواڕۆژیـش پێکەوە بەدەست بهێنە، تا بـەم جـۆرە سـوودت دوو هێنـدە ببێـت و، قازانجت هەزار ئەوەندە بێت.

کار بکە، پارەش پەیدا بکـە، بـەڵام لـە بـیرت بێـت پارەکـەت لـە شـتێکدا بـەکاربهێنیت کـە خـوای گـەورە ویسـتی لەسـەر بێـت و پێـی خۆش بێت.

گەر ئەو کەسە بەپێی خواست و ویستی خوای گەورە کـار بکـات، چارەنووسی چی دەبێت؟

بەم جۆرە هەستەکانی بەرەو ئامانجێکی زۆر بەرز و بڵند ئاڕاسـتە دەکـات و، خووەکـانی دەگۆڕێـت و، دەیانکاتــە سەرچـاوەیەك بــۆ پەرستش.

ئەگەر کەسێك بڵێت: "کەس ناتوانێت لەم کارە پاشگەزم بکاتەوە، من تازە هەر بە ئارەزووی خۆم ئەم کارە دەکەم، چیم وت هەر دەبێت ئەوە بێت!".

پێی دەوترێت کەللەڕەق (عیناد)، وا نییە؟

لەگەڵ وتی: "من ئەم خواردنە ناخۆم"، ئەگەر زۆریش برسیی بێت هەر نایخوات و، کەس ناتوانێت دەرخواردی بدات.

گەر بڵێت: "من حەزم لە وانەی بیرکاری نییە"، لە ئاکامی ئەم کەللەڕەقییەوە بەردەوام لە وانەی بیرکاریدا خراپ دەبێت و دەرناچێت، بەمەش قوتابییەکی تەمبەڵی لێ دەردەچێت و، تا ماوە باجی ئەم هەموو کەللەڕەقییەی دەدات.

خۆ ئەگەر بڵێت: "من ئیتر لەگەڵ ئەم کەسەدا قسە ناکەم"، بەهۆی ئەم پێداگرییەیەوە بەدەستی خۆی ئارامی خۆی تێك دەدات، چونکە بەم کارەی خۆی تووشی تاوان دەکات و، بە تێپەڕبوونی کات ئەم کەللەڕەقییەی دەبێتە ماڵێکی زۆر قورس بەسەر شانییەوە.

ڕەنگە ئەم کەسە یەك ساڵ کەللەڕەقیی لەسەر شتێك بکات کە شیاوی یەك خولەك پێداگریی نییە.

خۆ پەروەردگار هەستی سووربوون و پێداگریی بۆ کەللەڕەقیی پێ نەبەخشیون.

– ئەی بۆچی پێی بەخشیوین؟

- با بلّێین لە قوتابخانە وەرزی یەکەمی تاقیکردنەوەکان لە وانەی بیرکاریدا (چل) نمرەت هێنا، تۆش کەسێکی عینادیت، چی دەکەیت؟ بێگومان دەبێت سەعی بکەیت و تێبکۆشیت و، بەخۆت بلّێیت: "ئەبێ ئەم نمرەیەم بەرز بکەمەوە"، واتە کەللەڕەقیەکەت بۆ سەرکەوتن بەکاربهێنیت، بەم شێوەیە نەك هەر لەو وانەیەدا دەردەچیت، بەڵکو ڕەنگە لە داهاتوودا مامۆستایەکی بیرکاری سەرکەوتووت لێ دەربچێت.

نموونەیەکی دیکە:

نوێژەکانت لەکاتی خۆیاندا دەکەیت و، هەرگیز فەرامۆشیان ناکەیت، بەڵام هەرچی دەکەیت بۆ نوێژی بەیانی خەبەرت نابێتەوە.

تۆش چی دەکەیت؟ دەڵێیت: "لەمەودوا نوێژی بەیانیم نافەوتێنم، ئەبێ هەرچیم کردووە خەبەرم ببێتەوە بۆی". بۆ ئەمەش ڕێ و شوێنی تەواوەتی دەگریتەبەر و، بەم شێوەیە ئیتر نوێژی بەیانیشت لەدەست ناچێت.

لەم بارەدا بە کەللەڕەقیتان بەندایەتیتان ئەنجامدا، واتە هەستی عینادیتان لە هەستێکی خراپ دەرچوو و، گۆڕا بۆ پێداگریی لەسەر حەق و ڕاستی.

با یەك نموونەی دیکەش بهێنمەوە:

وای دابنیّ هەوڵی فێربوونی قورئانی پیرۆز دەدەیت، بەڵام زۆر لات سەختە و، بیر لەوە دەکەیتەوە واز بهێنیت و دەڵێیت: "کورە هەرچی دەکەم، مێشکم وەری ناگرێت!"، بەڵام گەر لەبری ئەمە بڵێیت: "من چیم لەو قورئان لەبەرانە کەمترە، کە هەموو قورئانیان لەبەرکردووە، کەچی من تەنانەت ناتوانم بیشی خوێنمەوە، بۆیە هەر دەبێت فێر ببم"، ئەوا لەماوەی چەند مانگێکدا قورئانخوێندن و ئاوخواردنەوەتان لادەبێتە یەك لە ئاسانیدا.

ئەمە زۆر جوانە، وا نییە؟ واتە ئەو هەستی پێداگرییەی خودا پێی دابوون، لە خزمەتی قورئاندا خستتانە گەڕ و، کەللەڕەقیی (عیناد)تان گۆڕی بۆ (پێداگری لەسەر ڕاستی).



کاتێك فڵان دەبینن لەناخەوە وەختە شەق بەرن، گەر بۆتان بلوێت بێ سەروشوێنی دەکەن، هەموو سەرکەوتنێکی ئەو ئێوە داخلەدڵتر دەکات، ئەگەر دڕکێك بچێت بە قاچیدا یان قاچی بەر بەردێك بکەوێت، ئێوە لە ناخەوە پێتان خۆشە و دڵتان ئیسراحەت دەکات.

هەموو ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی ئەو سەرکەتووە و، ئێمە سەرکەوتوو نین.. واتە لەبەر سەرنەکەوتوویی ئێمە دەبێت ئەویش وەك ئێمە بێت و سەرکەوتنەکانی لەدەست بدات!

باسی سیفەتی ئیرەیی (البُخل) دەکەین، حەسوودیشی پێ دەوترێت، کە لە هەر کەسێکدا هەبێت پێی دەوترێت بەخیل و حەسوود.

گەر هاوڕێکەت سەرکەوتوو بوو لە کارێکدا و تۆش بەخیلیت پێ برد، ئەوا لەو کاتەدا کێ زەرەر دەکات؟ هاوڕێکەت یان خۆت؟ بەدڵنیاییەوە خۆت زەرەر دەکەیت، خۆ هاوڕێکەت ئاگای لە کەینوبەینی دڵ و دەروونی تۆ نییە.

ئەی باشە بەخیلی تۆ ڕێگە لە سەرکەوتنی ئەو دەگرێت؟ نەخێر، بە هیچ شێوەیەك نابێتە بەربەست بۆی.

کەسی بەخیل و حەسوود هەردەم خۆی دڵتەنگ و بێزار و نائارامە و، لەبەر ئەوەی بەخیلیی بە برا یا خوشکێکی بڕواداریشی بردووە، ئەوا چاکەکانیشی دەسووتێت، هەروەك چۆن ئاگر دار دەسوتێنێت.

پێغەمبەرمان ﷺ تەنها ڕێگەی داوە باوەڕداران ئیرەیی بە دوو کەس ببەن:

یەکەمیان: کەسێکی خاوەن زانستێکی بەسوودە، کە کار بە زانستەکەی بکات و، خەڵکیش فێر بکات.

دووەمیـان: بڕواداریێکـی دەوڵەمەنـدە کـە پـارە و سـامانەکەی لـە ڕێگەی خوادا خەرج دەکات.[1]

ئـیتر هەرکەسـێك ئـەم دووانـە بناسـێت دەتوانێـت بڵێـت: خۆزگـە منیش توانایەکی وام هەبوایە و وەك ئەوانم بکردایە.

ئەمە ئیتر پێی ناوترێت حەسوود، بەڵکو حەزلێکردنە، حەسـوودی واتە بەخیلیی بردن بەوەی خەڵکی هەیانـە و حەزبکـەیت لێیـان زەوت بکرێت و ئەوان هیچیان نەبێـت، بەڵام حەزکردن واتـە ئـارەزوو بکـەیت کە تۆش بە ئاستێکی وا بگەیت و، بڵێیت: "باشە مـن لـە چـیم کەمـە، ئەبێت منیش ببمە کەسێکی زانا".. هەر بۆیە زیاتر و زیاتر دەخوێنیت و دەخوێنیتـەوە، تـا لەکۆتایـدا کەسـێکی زانـات لـێ دەربچـێت، ئـیتر بەمەش دەوترێت: (پێشبڕکێ کردن لەپێناو بەدەستهێنانی شتی بـاش و چاکدا).

بـەم جـۆرە خوویـەکی خراپـی وەك حەسـوودیی، دەگۆڕیـت بـۆ هەستێکی وەك حەزکردن و پێشبڕکێ بۆ کاری چاکە.[2]

---

١- صحيح البخاري: ٧٢.

٢- لە (مەکتووبی تۆیەم)ەوە وەرگیراوە.

## ئارامگرتن (سەبر)مان چەند پلەیە؟



لە قوتابخانە دەرچوویت و، کارێکی زۆر بە پەلەت هەیە و، دەبێت هەرچی زووترە بڕۆیتەوە بۆماڵەوە، بۆیە ناتوانیت هێواش بڕۆیت و زۆر بە پەلە دەڕۆیت.

هەر کە گەیشتیتە ئاستی پلیکانەکانی قوتابخانە، دوو دوو سێ سێ بەسەر پلیکانەکاندا بازت دا و هاتیتە خوارەوە.

لەناکاو هاوسەنگیت لەدەستدا و قاچت وەرگەڕا و، خۆت لەسەر زەوی بینییەوە، کە هەستایتەوە تەماشا دەکەیت ئەژنۆت بریندارە و، قۆڵت ڕووشاوە، قاچت شینومۆر بووەتەوە.



دەڵێن: (ئەوەی پەلە بکات، بەرەو مەرگ دەڕوات)، ئەمجارە خوا ڕەحمی کرد و بە یەك دوو برینی بچووك دەربازت بوو، بەڵام ئەگەر کەمێك وریاتر بویتایە و، پلیکانەکانت یەك یەك ببڕیایە، ئەم دەردی سەرییەت نەدەبینی.

- باشە لێرەدا چ هەڵەیەکم کردووە؟

- کەم حەوسەڵە و بێ سەبر بوویت؟

- سەبر یەعنی چی؟

- سەبر، واتە ئەنجامدانی کارەکان بە وریایی و ژیرییەوە و بێ پەلە کردن.

- چەند جۆر سەبر هەیە؟

- سێ جۆر:

**یەکەم: ئارامگرتن لەسەر ئەنجامنەدانی تاوان**

شەیتان بەردەوام مرۆڤ بەرەو تاوان و گوناه ڕادەکێشێت.. لەم بارەدا ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی نەکردنی شەیتان، مرۆڤ لە خودا نزیک دەخاتەوە.

لە گوناهدا شتگەلێکی بەچێژ هەیە، بەڵام کەسێك کە دانا بێت و بە خۆشییە کاتییەکانی گوناه فریونەخوات و، بە سەبر و ئارامییەوە هەڵسوکەوت بکات، ئەوا خۆی لە چاڵی تاوان دەپارێزێت.

**دووەم: ئارامگرتنە لەسەر ئەو ڕووداو و دەرد و نەخۆشییانەی کە بەسەرماندا دێت**

ئەم جۆرە ئارامگرتنە متمانەمان بەخودا دەردەخات، واتە بە وتنی: "مادام لە خوداوەیە قەینا، ئەو ئێمەی لەخۆمان خۆشتر دەوێت" تەوەککول و سەبرمان دەردەکەوێت و، کۆڵ و باری ئەم

کارەساتانەمان لەسەر شان سووك دەبێت و، لە ناخیشەوە ئاسوودە دەبین.

خۆ ئەگەر بڵێیت: "بۆچی ئەم ڕووداوانەم بەسەردا هات؟ بۆچی من دایمە نەخۆشم؟" ئەوا هەر زوو ورە و دەروونمان تێکدەشکێت.

**سێیەم: ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان**

ئەم ئارامگرتنەش ئێمە بەرەو خۆشەویستی خودا پەلکێش دەکات.

واتە پەرستشێکی وەك نوێژ، کە هەموو ڕۆژێك پێنج جار دەیکەین، خۆی لەخۆیدا جۆرە ئارامگرتنێکە، کەسێك کە پێنج فەرزە نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدات، مرۆڤێکی زۆر بە سەبرە، بەڵام ئەگەر نائارام بێت و بڵێت: "تا کەی نوێژ بکەم، چەند ڕۆژی تر بەردەوام بم؟" ئەوا خۆی هەست بە چێژی ئەو نوێژە ناکات و، هیچ سوودێکیشی لێ نابینێت.

(ڕۆژووگرتن)یش ئارامگرییەکی کەم وێنەیە، چونکە خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە لە پارشێوەوە تا بەربانگی ئێوارە تەنها بە ئارامگرتن دەبێت، هەر بۆیە ئەو کەسانەی بەڕۆژوو نابن لە تاقیکردنەوەی ئارامگرتندا سەرکەوتوو نەبوون و دەرنەچوون.

ژیان هەمووی بەم جۆرەیە، هەمیشە ئەو کەسانەی سەبریان نییە ناتوانن سەرکەوتوو بن و، تەمبەڵیی دەکەن و هەر بە دواکەوتوویی

دەمێننــەوە، لەبەرامبــەردا هــەر مرۆڤێکــی ســەرکەوتووت ناســیبێت نیعمەتی ئارامگریی بە باشیی بەکارهێناوە.

پێغەمبــەری نازدارمــان ﷺ کەســێکی زۆر پشــوودرێژ و بەســەبر بووە و، بە ئارامگرتن بەرەنگاری هــەموو ئــازار و ناڕەحــەتی و دەرد و نەبوونی و نەخۆشی و ئەشکەنجە و مەینەتییەك بووەتەوە، هــەر بۆیــە لە ئەنجامــدا لــە گەیانــدنی بانگەوازەکەیــدا ســەرکەوتوو بــوو و، تــوانی جوانییەکانی ئیسلام بە هەموو لایەکی دونیادا بڵاو بکاتەوە.. هەروەها بــووە خۆشەویســتی هــەمووان و، مامۆســتا و فێرکــاری مرۆڤایــەتی و، ڕێزداری نێو ڕیزی بوونەوەران.

پێشینانیش وتویانە: "ئارامگرتن تاڵە، بەڵام بەرەکەی شیرینە".[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.

# مزگەوتی سانگی یەدیم (گریمان خواردم)

# چۆن دروستکرا؟



"کاتێك چێژ و خۆشییەکان بانگت دەکەن پێویستە بڵێیت:"گریمان خواردم".. چونکە ئەوەی (گریمان خواردم)ی کرد بە ڕێسا بۆ خۆی دەیتوانی بایی پارەی دروستکردنی مزگەوتی (سانگی یەدیم) خواردنی خۆشی بخواردایە، بەڵام نەیخواردا".

یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری ئەستەنبوڵ گەڕەکی (فاتح)ی پێدەڵێن، لە کوچە و کۆڵانەکانی ئەو گەڕەکەدا مزگەوتێکی بچووك هەیە، ناوی مزگەوتی (سانگی یەدیم)ە واتە (گریمان خواردم).

دەگێڕنەوە لە کۆندا پیاوێك هەبووە بەناوی (کێچەلی خەلیل)، ئەم پیاوە هەر کات بە نێو بازاڕ یان کۆڵاناندا بڕۆیشتایە و حەزی لە

خوادنێك یا شتێك بكردایە یەكسەر دەستی دەبرد بۆ گیرفانی و جزدانەكەی دەردەهێنا، بەڵام لەو كاتەدا لە كڕینی شتەكە پاشگەز دەبوویەوە و، دەیوت: "گریمان خواردم" و نەیدەكڕی.

ئەم پیاوە دەستی كرد بە كۆكردنەوەی ئەو پارەیەی كە هەموو جارێك لە پاشگەزبوونەوەی لە كڕینی شتێكدا گلی دەدایەوە، ساڵ هات و ڕۆشت، تا وای لێهات پارەی ئەم پیاوە گەیشتە ئەوەی بەشی دروستكردنی مزگەوتێك بكات.

بەم جۆرە مزگەوتەكەی بنیات نا و بەناوبانگ بوو، هەڵوێستی كابرا لە هەموو لایەكەوە دەنگی دایەوە و كەس نەما نەیزانێت، چونكە بە هەڵسوكەوتەكانی وانەیەكی وای خەڵكی دادا كە لە هەموو دڵ و دەروون و ژیرییەكدا جێی خۆی كردووە.

– ئەبێ ئەم پیاوە بە چەند ساڵ ئەم هەموو پارەیەی كۆكردبێتەوە؟

– ڕەنگە بە دە ساڵ، یان بیست ساڵ، یا هەموو تەمەنی خەریكی كۆكردنەوەی ئەو پارەیە بووبێت.. لە ڕاستیدا گرنگ نییە چەندی پێ چووە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە ئەو ئەم هەموو خووەی لا دروست بووە و، نییەتە پاكەكەشی بەس بووە، تەنانەت ڕەنگە زیادیشی هەبووبێت.

– یەعنی ئێمەش لەمەودوا بڵێین (گریمان خواردم)؟ گەر ئێمەش وا بڵێین دەتوانین وەك ئەو مزگەوت بكەینەوە؟

- مزگەوتی (گریمان خواردم) تەنها نموونەیەکە و، ئێمەش بەگوێرەی شێوازی ژیانی خۆمان (گریمان خواردم)ێکمان هەیە.

گەر پارەی تەواومان پێ بێت، حەزمان لە هەر شتێك کرد دەستمانی بۆ درێژ دەکەین و، بێ دڵیی خۆمان ناکەین: شیرینی، هەمبەرگر، دۆندرمە و، هەموو ئەو جۆرە خواردن و خواردنەوانەش کە پارەیەکی زۆریان تێدا خەرج دەکەین.

باشە ئەمانە پێویستین؟ وای دابنێ چەند ڕۆژێك نەتخواردن، یان هەفتەیەك، تەنانەت ئەگەر مانگێکیش ئەم شتانە نەخۆیت، هیچ دەبێت؟ پێموایە کە هیچ کێشە و گرفتێك ڕوونادات.

ئەگەر کراس و پێڵاوی پێویستمان هەبێت، کەچی هەموو وەرزێك تازەترین مۆدێلی جلوبەرگ بکڕین، ئەوا ئەم خووەمان دەبێتە هۆی کونبوونی گیرفانەکانمان و مایەپووچبوونمان.

- با بڵێین: ئۆتۆمبێلێکت هەیە، کە کاروباری خۆتی پێ ڕایی دەکەیت، پێداویستییەکانی خۆتی پێ دابین دەکەیت، کەچی ئارەزووی کڕینی ئۆتۆمبێلێکی نوێش دەکەیت، بەڵام پارەی تەواوت لەدەستدا نییە، ئەوە دەبێت بە دەستبڵاوی و زیادەخەرجی؟

- بەدڵنیاییەوە دەبێت بە دەستبڵاوی.

لەم باسەدا چەند پەندی پێشینانمان هەیە، وەك: (هەموو سەرکەوتنێك دابەزینی هەیە)، (هەتە درێخی مەکە، نیتە قەرز مەکە).

پاره پەیداکردن و سامان پێکەوەنان خوویەکی باشە و، مرۆڤ هەمیشە لە هەمان باردا نامێنێتەوە و، ژیانی شیاوی بەرەوباشتر گۆڕانە.

بەڵام لایەنی جوانی ئەم کارە زیادەڕەوی نەکردن و دەست بڵاونەبوونە لە خەرجکردنیدا، کەوابوو ئەمە لەهەمان کاتدا پەرستشیشە، چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: (لە بەری ئەم دارو کشتوکاڵەتان بخۆن بۆتان حەڵاڵە. لە ڕۆژی پێگەیشتن و دروێنەدا حەقی خەڵکی لێ دەرکەن و خێرو صەدەقەی لێ بکەن. لەم خێرکردن و بەخشینەیشدا زیادەڕەوی مەکەن، مامناوەندی بن. خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە زیادەڕەوی ئەکەن و لە سنوور دەرئەچن) الأنعام: ١٤١.

ئەمە نە ڕەزیلی و نە چرووکی و نە دەستنوقاویشە، تەنهاوتەنها خوویەکی جوان و جێی ڕێزە و، جۆرێکە لە ڕێزگرتنی نیعمەت، هەروەها ژیانە بەپێی ویستی خودا و، ژیرانە بەرەوپێشچوونە.

لەسەرپێی خۆت وەستانتە بە شەرەفمەندییەوە، دوور لە دەستپانکردنەوە و سواڵکردن و ئارەقی شەرمەزاری ڕشتن.

بەڵام لە پەنجا شەست ساڵی ڕابردوودا بووینەتە کۆمەڵگەیەکی بەکارهێنەر و، کڕین و فرۆشتنمان لەسەر بنەمای تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانمانە نەك پێویستی پڕکردنەوە، هەر بۆیە کە پێداویستییەکانمان سەد هێندەی جاران زیادیان کردووە.

هەرچییەك لە بازاڕ و دووكان و پێشانگاكاندا بفرۆشرێت وەك پێداویستییەكی ژیانمان لێی دەڕوانین، بەڵام چ هەوڵ و كۆششێك فریای دابین كردنی ئەم هەموو كەرەستەی خۆشگوزەرانی و ڕازاندنەوەیە دەكەوێت! بەڕاستی هیچ پارە و سامانێك بەشی ئەم هەموو شتانە ناكات.

جا ئەگەر خولیای مۆدێل گۆڕین و شتی ماركەت هەبێت، ئەوا ئیتر پارە و سامانی دنیا بەشت ناكات! بێگومان ئەم دۆخەش قەرزكردن و قەرزداری بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

بۆ دەربازبوون لەم خووە نەخوازراوانە و گۆڕینیان بە خووی باش و جوان، تەنها یەك ڕێگەی دەربازبوون هەیە، ئەویش خۆدوورخستنەوەیە لە زیادەڕۆیی و خۆڕاهێنانە لەسەر دەستگرتنەوە و بە قەناعەت بوون، تا ئێمەش بەمە مزگەوتی ژیانی خۆمان دروست بكەین.[1]

---

١- لە (مەكتووبات، ناوكەكانی حەقیقەت) وەرگیراوە.

# ئەوەی هەموو شتەکان بە جوانی ببینێت،

# بەجوانیش بیردەکاتەوە



"ئەوەی جوان ببینێت، جوانیش بیردەکاتەوە، هەر کەسیش

جوان بیربکاتەوە چێژ لە ژیان دەبینێت".

ئەم دێرە شێواز و نهێنییەکە بۆ خۆشترکردنی ژیان و گوزەران.

بنەمایەکە کە چێژ بە ژیان دەبەخشێت.

پێوەرێکە بۆ دڵخۆش بوون و، هەردەم بە بەختەوەری مانەوە.

ڕێگەیەکە کە لە هەموو بارودۆخێکدا ئومێدەوارتان دەکات.

ڕێگەچارەیەکە بۆ نەهێشتنی ڕەشبینی و بەدبینی.

هێزێکە کە لەگەڵ سەرکەوتندا ڕاتان دەهێنێت و چێژی

هەوڵدانتان پێ دەبەخشێت.



تروسكەی ڕووناكیەكە كە ئێستا و داهاتووتان ڕووناك دەكاتەوە.

– باشە ئێمە شتەكان بە جوانی دەبینین، یاخود هەر خۆیان جوانن؟

– لەبەر جوان بینینی ئێمە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە هەموو شتێکی بە جوانی بەدیهێناوە، جا یا هەر بەیەکەم نیگا دەزانین فلآنە شت جوانە، یان ئەوەتا لەکۆتاییدا پەی بە جوانییەکانی دەبەین، بەلآم زۆر گرنگە لەسەرەتاوە هەموو شتێك بە جوان ببینین و، بە نیگایەکی ئەرێنی (ئیجابی) لێیان بڕوانین و، هەوڵ بدەین بە چاوێکی پڕئومێدەوە تەماشایان بکەین.

ئەگەر دە کەس ڕووداوێك بە خراپ هەڵبسەنگێنن، ئەوا ناخی ئەو دە کەسە هەر هەموویان ڕەش دەبێت و، ورەیان دەڕوخێت و، تروسکایی هیوایان دەکوژێتەوە.

بەلآم تۆ بە پێچەوانەی ئەوانەوە بە، هەرچۆنێك بووە ڕووە باش و جوان و ئەرێنییەکانی ڕووداوەکە بدۆزەوە، بەم جۆرە هەم خۆت ئارام دەبیت و، هەم دەبیتە هیوایەکیش بۆ دەوروبەرەکەت، واتە هەوڵی ڕووناککردنەوەی کەشی تاریك و لێڵی ڕووداوەکە بدە.

وای دابنێین ڕۆژێك ڕێتان کەوتە سەر شەقامێك و لەناکاو دوو ئۆتۆمبێل بەیەکیاندا دا..

دەبینیت هەردوو ئۆتۆمبێلەکە زیانیان بەرکەوتووە و، سەرنشینەکانی ناویان بریندار بوون.. گریان و ناڵە ئەو دەورەی گرتووەتەوە، هەمووان دەڵێن: "وای، وش تخوا! بریا واو وایان

بکردایە.. ئاخر نەئەبوو وا بکەن" بەم جۆرە هەر باسی لایەنە خراپ و تاڵەکانی ڕووداوەکە دەکەن و، قوڕەکە خەستتر دەکەنەوە.

تۆش لەوێ ئامادەیت و، شایەتحاڵی ڕووداوەکەیت، ئایا پاش لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی دۆخەکە، چی دەڵێیت؟

باشتر وایە بڵێیت:

"هەموو کەسێك تووشی هەڵە دەبێت، ئەم ڕووداوەش بەهۆی ناوشیاری و کەمتەرخەمییەوە ڕووی داوە، بەڵام دەکرا دۆخەکە زۆر لەمەش خراپتر و تاڵتر بێت، بۆ نموونە ئۆتۆمبێلەکان بەچاوتروکانێك کڵپەی ئاگریان لێوە بەرز بووبووایەتەوە، ئەوەتا بە هەندێ زەرەری ماددی و چەند برینێك ڕزگارتان بووە، بێگومان لەمەولا وریاتر دەبن، قەزاوبەڵای خۆتانی بردبێت، بەهۆی ئەمەوە لە داهاتوودا لە زیانی زۆر گەورەتر خۆتان دەپارێزن."

هەر شتێکمان بەسەردا بێت ویستی خودایە، خواش ستەم لە هیچ بەندەیەکی ناکات. هەندێ جار ڕاستەوخۆ ڕەحمەتی خۆی بەسەر بەندەکانیدا دەبارێنێت، هەندێ جاریش لە ئەنجامی ڕووداوی ئاواوە ڕەحمەتی خۆیمان پێ دەبەخشێت.

ئەو کەسەی هەست بە هەڵەکانی خۆی دەکات، دەتوانێت لە کاتی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانیشیدا کەمتەرخەمییەکانی خۆی

ببینێت و، هەوڵ بدات بۆ خۆچاککردن و نەهێشتن یا –هیچ نەبێت– کەمکردنەوەی هەڵەکانی.

گەر ئەو کەسانەی لەم پێکدادانی ئۆتۆمبێلەدا زیانیان لێ کەوتووە بڕوادار بن، ئەوا زیانەکانیان بۆ دەبێتە خێر، بۆیە ئەگەر لەسەر زیانەکانی ڕووداوەکە ئارام بگرن ئەوا پاداشتیشیان بۆ دەنووسرێت، چونکە ئەمانە تێگەیشتوون کە گیان وماڵیان ئەمانەتە و، لە پاش ئەو ڕووداوەشەوە ئەو تەمەنەی کە ماویانە بەشێوەیەکی باشتر دەیبەنە سەر.

کەواتە هەروەک چۆن ئەم ڕووداوە تۆی ڕەشبین نەکرد، هەوڵ بدە دڵنەوایی ئەوانە بکەیت کە ڕووداوەکەیان بەسەردا هاتووە.

نموونەیەکی دیکە:

کەسێکتان بینی قۆڵی نییە، یەکسەر قۆڵی خۆتان هاتەوە بیر و لە جوانی و بەهای قۆڵی خۆتان تێگەیشتن.

کەسێکتان بینی کە قاچەکانی لەدەستدابوو و، یەکسەر سوپاسی خوداتان کرد لەسەر قاچەکانتان، هەروەها لەوەی کە پێڵاوەکانتان بەدڵ نەبووبوو پەشیمان و شەرمەزار بوون.

ڕووبەڕووی کەسێك بوونەوە کە زمانی خۆی لە خراپ و نەشیاو نەدەپاراست و، درۆی دەکرد و، قسەی بە خەڵك دەوت و، جنێوی

خراپی دەدا.. لەوەوە فێری خراپیی درۆکردن بوون و، فێر بوون چۆن ئاگاتان لە زمانتان بێت و، جڵەوی بکەن.

ڕۆژێکی زستان... سەرماوسۆڵە و بەفر و قوڕ و سەهۆڵ هەموو لایەکی گرتووەتەوە، ئەگەر ئێوە بیر لەوە نەکەنەوە کە دوای زستان بەهاری جوان و قەشەنگ دێت و، جوانییەکانی نەهێننە خەیاڵتان، ئەوا بێ هیوا دەبن و داهاتووتان بە تاریك و لێڵی دەبینن.

هەواڵی وەفاتی خزمێکتان پێدەگات کە زۆر دیندار و دڵپاك و ڕەوشت بەرز بوو و، هاوکاری هەمووانی دەکرد، ئێوەش گەر بڵێن: "خوا ڕەحمی پێ بکات، لە مەینەتییەکانی دونیا ڕزگاری بوو و، بۆخۆی ڕێگەی بەهەشتی گرتەبەر، ئێمەش ڕێبواری ئەو ڕێگەیەین". ئەوا هیچ بەربەستێك لەڕێی چێژوەرگرتنتان لە ژیان نامێنێتەوە.

باخچەیەك تازە ئاودرابوو، بۆیە خاکەکەی بووبووە قوڕ، پەینی ئاژەڵیی بنی دارەکانیش بۆنی دەهات، هەرکە چوویتە ناو باخچەکەوە قوڕاوی بوویت و، بۆنی پەینەکەش بێزاری کردیت و، وتت: "ئای! کە باخچەیەکی پیسە" و، لێی هاتیتە دەرەوە.. بەم کارەت خۆت لە بینینی دیمەنی ئەو گەڵا سەوز و، گوڵە بۆنخۆش و گەشاوە و، میوە جوان و ئاودارانە بێ بەش کرد.. لەکاتێکدا ئەگەر ئەو قوڕە و، ئەو پەینە نەبێت کە دەکرێتە بنی درەختەکان، باخچەش لە باخچەیی دەکەوێت و، دوای چەند ساڵێك دەبێتە دەشتێکی کاکی بەکاکی.

دەتوانن لە ژیانتاندا نموونەی لەم شێوەیە بهێننە پێش چاوی خۆتان و، لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژانەتان بەراوردی بکەن، چونکە بەم شێوازە هەم جوان دەبینن و، هەم جوان بیردەکەنەوە و، چێژیش لە هەموو ساتەکانی ژیانتان دەبینن.

کەواتە پێش هەموو شتێك گرنگ ئەوەیە توانای ببینین و بیرکردنەوەمان هەبێت.[1]

---

١- لە (مەکتووبات، ناوکەکانی حەقیقەت)ەوە وەرگیراوە.

# با نزایەکی زۆر جوان و شیرینیش فێر ببین



پەروەردگارم! تۆ خوای منیت، چونکە ئێمە بەندەین، دەستەوەسانین و ناتوانین نەفسی خۆمان پەروەردە بکەین و، توانامان بەسەریدا ناشکێت، کەواتە ئەو زاتەی پەروەردەمان دەکات تەنها تۆیت.

تۆ بەدیهێنەریت، ئێمە بەدیهێنراوین، چونکە ئێمە نەبووین، بەڵام تۆ ئێمەت هێنایە بوون و، نیعمەتی بوونت پێ بەخشین، کەواتە بەدیهێنەری ڕاستەقینە تەنها تۆیت.

تۆ ڕۆزیدەر (الرزاق)یت، واتە تەنها تۆ نان و ئاو و خۆراک و پۆشاک و پێداویستییەکانمان بۆ دابین دەکەیت، ئێمەش پێویستمان بە ڕزقە و، دەستمان بە هەموو شتێک ناگات، کەواتە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەری ئێمە تۆیت.

تۆ خاوەن موڵك (مالك)یت و، هەموو شتێك هی تۆیە و موڵكی تۆیە.. ئێمەش لە موڵكی تۆدا كار دەكەین و دەژین، كەواتە تەنها تۆ دەتوانیت بمانخەیتە كار و، هەموو شتێكمان لەدەستی قودرەتی تۆدایە و، تەنها تۆ خاوەنی بڕیاریت بەسەرمانەوە.

تۆ خاوەنی شان و شكۆ و مەزنی (العزیز)یت، چونكە ئێمە كاتێك لە بچووكی و بێ دەستەڵاتیی خۆمان دەڕوانین، مەزنیی و شكۆداریی تۆ بەسەرمانەوە دەبینین، كەواتە ئێمە ئاوێنە و ڕەنگپێدەرەوی شكۆی تۆین، بوون و شەرەفمەندیمان لەتۆوەیە.

تۆ دەوڵەمەندی ڕاستەقینە و بێ سنور (الغنی)یت، خاوەنی گەردوون و هەموو بوونەوەرانی نێویت، ئێمەش لەبەر هەژاریمان، سامانێكمان پێ دەبەخشرێت، كە دەستی هەژاری خۆمان هەرگیز توانای وەدەستخستنی نییە، كەواتە دەوڵەمەند و ساماندار تەنها تۆیت، بەخشەریش هەر تۆیت، كە هەموو پێداویستییەكی هەموو بوونەوەران بێ بەرامبەر دابین دەكەیت.. هەموو شتێك پێویستی بە تۆ هەیە، بەڵام تۆ پێویستیت بە هیچ شتێك نییە و، لە هەموو پێویستییەك بەریت.

تۆ خاوەنی تاك و تەنهای ژیانی ڕاستەقینە (الحی)یت، كە هەرگیز نامریت و، ژیانت ئەزەلی و ئەبەدییە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە بوونەوەرێكی خاوەن تەمەنێكی دیاریكراوین و لەكۆتاییدا هەر

دەمرین، لە مردن و لە زیندووبوونەوەشماندا نازی بەخششی ژیانی تۆ بەسەر خۆمانەوە دەبینین.

تۆ خاوەنی دەستەڵاتداری مانەوەیت (الباقی)یت، ئێمەش فانین و، بوونەوەرێکی کاتین و، ئەم جیهانی دونیایە جێ دەهێڵین، بەڵام لە فانی بوون و کاتی بوونی خۆماندا بەردەوامیی و مانەوەی تۆ دەبینین. کەواتە، تەنها زاتی موبارەکت شایەنی مانەوەی تاهەتایە.

تۆ چاکەکاری بێ سنوور (المحسن)یت، بەڵام من بەندەیەکی تاوانبارم و، لە گوناهەکانم پەشیمان بوومەوە، تەوبەم کرد و، بۆ لای تۆ گەڕامەوە، کەواتە ئەوەی لێم خۆش دەبێت و بە جوانییە نەبڕاوەکانم شاد دەکات تۆیت.

تۆ بەخشەر و لێبوردەی گوناهەکان (الغفور)یت و، منیش لەناو گوناهدا سەرم لێ شێواوە، کەواتە ئەوەی لە گوناهەکان دەبورێت تۆیت، جگە لە دەرگای ڕەحمەتی تۆ دەرگایەکی دیکە شك نابەم.

تۆ مەزنی ڕاستەقینە (العظیم)یت، منیش کەم نرخ و بچووك و داماوم، کەواتە گەورەیی تۆ لەسەروو هەموو ستایشێکەوەیە.

تۆ خاوەنی هێز و توانا (القوی)یت، هەموو بوونەوەران لە سایەی دەستەڵات و فەرمانی تۆدان، منیش بێ دەستەڵات و لاوازم، بەڵام هێزێك لەسەرروومەوە دەبینرێت، کەواتە هەموو هێز و توانایەك لەتۆوەیە.

تـۆ ئـەو زاتـەیت کـە گـەردوونی بـە دیارییـە میهرەبانانـەکانی پڕکردووەتـەوە واتـە (المُعطي)یـت و، هـەموو پێداویسـتییەکانمان بـە باشترین شێوە پێ دەبەخشیت، چونکە من هەموو کاتێك و لـە هـەموو بوارێکـدا بـەردەوامیم دەوێـت و، لـە دەرگـای ڕەحمەتتـدا لێـت دەپاڕێمەوە، کەواتە ئەو زاتەی هەموو پێویستی و داواکارییـەکانم پـێ دەبەخشێت و، هەموو ئارەزوویەکم بۆ دەهێنێتە دی تۆیت.

تـۆ بڕواپێکـراو و جێـی متمانـە (الأمـین)یـت، ئێمـە بەتـەواوی متمانەمان پێتە و، لە سایەی متمانەی تۆدا دەژین، چونکە ئێمـە بـە ترس و نادڵنیاییەوە دەژین، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ جێی متمانەمانیت، ئەوا بە پشت بەستن بـە زاتـی موبارەکت لـە دەست هـەموو تـرس و مۆتەکە و خەیاڵ و ئەندێشەیەك ڕزگارمان دەبێت، کەواتـە ئـەو زاتـەی لـە کـاتی هەسـتکردنمان بـە مەترسـی دڵنیامـان دەکاتـەوە و ئاسوودەییمان پێ دەبەخشێت تۆیت.

تـۆ سـەخی و ماقبـدە و بەخشـندە (الجوّاد)یـت و، هـەموو شـتێك بەزیادەوە دەبەخشیت، منیش نەدار و، دەستەوەسانم لە دابینکردنـی پێداویسـتییەکانمدا، کەچـی لەگـەڵ بێدەسـتەڵاتیم لـەناو دەوڵەمەندییەکدام، کەواتە زاتی بەخشندەی چاکەکار تەنها تۆیت.

تـۆ وەڵامـی نزاکانمـان دەدەیتـەوە واتـە (المجیب)یـت، ئێمـەی بوونەوەرانیش بەزمانی حاڵمان هەمیشـە داوادەکـەین و دەپاڕێینـەوە،

تا ئارەزووەکانمان بێنەدی و داواکاریەکانمان پێ ببەخشرێت، کەواتە ئەو زاتەی وەڵامی هەموو داخوازییەکانمان دەداتەوە تەنها تۆیت.

تـۆ شـیفای هـەموو دەرد و نەخۆشـییەك دەدەیـت چـونکە (الشافی)یت، منیش نەخۆشم و لەناو دەرد و مەینەتیدام، بەڵام لەگەڵ هەموو نەخۆشکەوتنێکمدا هەست بە مـەزنیی نـاوی (شیفابەخشـەر)ی زاتی موبارەکت بەسەر خۆمەوە دەکەم، کەواتە ئـەو زاتـەی دەرمـانی هەموو دەردێك دەکات و، شیفای هەموو نەخۆشێك دەدات تۆیت.

پـەروەردگارم! لـە گوناهـەکانم خۆشـبە، لـە تاوانـەکانم ببـوورە، شیفای دەردەکانم بدە، لێبوردەیی خۆت بڕژێنە بەسەر دایکم و باوکم و هەموو ئەو خوشك و برایانەم کە خزمەتی ئیمان دەکەن.

تەندروستی و خۆشگوزەرانیمان پێ ببەخشە، منـیش و ئـەوانیش لەو بەندانـەت هـەژمار بکـە کـە لێیـان ڕازیـت، سۆز و بـەزەیتمان لـێ دامەبڕە... سوپاس و ستایش و منەت تەنها بۆ تۆیە. ئامین[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیستەم)ەوە وەرگیراوە.